مامۆستا حەقیقی :

# تەخمیسی
# موناجاتی حاجی قادر

ئەی پاک و تاک و تەنیا ، ئەی خێوی مەند و جاری
ئەی ئەو کەسەی کە هەر تۆ ، عاری لە عەیب و عاری
یاری نیازمەندی ، نیتە نیازی یاری
ئەی بێ نەزیر و هەمتا ، هەر تۆی کە بەرقەراری
بێ دار و بێ دیاری ، بێدار و پایەداری

* * * * *

خوای ئەرز و ئاسمانی ، رازی دڵان دەزانی
ئاوی گوڵان دەدێری ، مایەی بەری رەزانی
مێخۆش و مزر و شیرن ، تام و مەزەی مەزانی
بۆ باغی مەردی باغی ، سەرمایەکەی خەزانی
بۆ مەزرەعی فەقیران ، سەرمایەکەی بەهاری

* * * * *

شایانی تۆیە شایان ، بۆ سوژدە سەر دەکەن خەم
شایی شیاوی تۆیە ، تۆ یەم ئەوان لە نەم کەم
تۆی نازمی گەڕانی ، رۆژ و شەوی مونەززەم
تۆ پادشا نیشانی ، بۆ هەر سەوادی ئەعزەم
بێ سەدر و شانشینی ، بێ پەردە پەردەداری

* * * * *

بینای نیزیک و دووری ، بەخشەندە و غەفووری
عیسیان بەوێ وفووری ، هەر تۆی کەلێ دەبووری
تۆ مالیکوڕڕیقابی ، مڵکت نیە سنووری
جەبباری بێ فتووری ، سوڵتانی بێ قسووری
رەززاقی مار و مووری ، ئاودێری دێمەکاری

* * * * *

ئەو ئاسمان و ئەرزەی ، پڕ تەنتەنە و شکۆیە
ئەو شەمسی عالەم ئارا ، ئەو کەهکەشان و کۆیە
ئەو دەشتی وەک بەهەشتی ،بەو شکڵ و رەنگ و بۆیە
فەیرووزە تەختی گەردوون ، مەسنووعی نەقشی تۆیە
یاقووت و لەعل رۆژە ، ئەستێرەکان دوراری

* * * * *

فەرمووتە "لەن تەڕانی"، بەڵام بەوەی عەیانی
هەرچی لە ماسیوا دا ، تۆ خالیقی هەمانی
وەخت و زەمانی تۆیە ، بێ وەخت و بێ زەمانی
جێ و مەکانی تۆیە ، بێ جێ و بێ مەکانی
لەیل و نەهاری تۆیە ، بێ لەیل و بێ نەهاری

* * * * *

لەو رۆژە دا دەفەرمووی ،ئی کێ یە مڵک و بەرهەم
ئی تۆیە قەهر و قودرەت ، باکت نیە لەو و لەم
بێ نایب و وەزیری ، ناکەی پرس بەو و بەم
هەر ئەمری تۆ مەدارە ، بۆ کار و باری عالەم
هەر چەندە بێ وەزیر و ، بێ سەدر و کار و باری

* * * * *

عەقڵ سەری دەماسێ ، لە پەردە و حیجابان
باز و هەڵۆی تەفەککور ، مێشوولەیێکی بەربان
فەرمانبەر و موتاعن ، بەحر و بەڕ و بیابان
سەحرانەوەردی شەوقت ، خورشید و ماهی تابان
دوو جاریەن شەو و رۆژ ، بێ مەحمیل و عەماری

* * * * *

مەخلووقی زاتی تۆیە ، عالەم درشت و وردی
زەڕڕاتی کائیناتێ ، ئەڵڵایە زیکر و ویردی
تەنیا نە هەر "حەقیقی" حەمدی سیفاتی کردی
مەعلوومە بۆچی "حاجی" مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی . نەکراوە مەدحی باری

# نێوەرۆک



وێنەی روو بەرگ : شوانێک لە هەورامان
وێنەی پشت بەرگ : بەندی ورمێ
وێنەی نێوەڕاست : ئاوایی میانە لە نێوان سنە و مەریواندا (سوپاس لە عەکاسی تیشکی سنە)

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی

سروە

لە ژێر چاودێری دەستەی نووسەران
ناونیشان : اورمیە ـ خیابان شهید باکری ـ نبش کوی ساعد ـ انتشارات صلاح الدّین ایوّبی ( مرکز نشر فرهنگ و ادبیّات کردی ) تلفن : ٣۵٨٠٠


## وێڕای سڵاو

## لە خوێنەرانی بەڕێز

کام ئینسانی خاوەن فیکر گومانی لەمەدا هەیە کە لەڕێ لادانی کۆمەڵێک لە کوشتنیان دزێوترە؟ کێ بێ بڕوای بەمە نەبێ کە رێنموونی کردنی ئینسانێک لە زیندوو کردنەوەی مردووێک گرینگترە؟ ئاشکرایە کە یاریدەدانی سەر لێ شێواوێک، دەست گرتنی داماوێک، کۆمەک بە لێقەوماوێک نەک هەر دەبێتە هۆی رەزامەندی خوا، بەڵکوو کوڵ و کۆی دڵ و دەروونی تامەزرۆی ئەویندارانی سەربەستیش دادەمرکێنێ.

بۆ بەختەوەری هەرکەس تەعبیرێکی جیاوازی هەیە و ئەم تەعبیرە لێک جیاوازانە لە زۆر جێگادا ناتەبایی‌یەکی بنەڕەتی ئەوتۆ پێک دێنن، کە زاناکانیش سەرەدەری لێ ناکەن، ئێمەش نامانەوێ لێرەدا خۆی پێوە خەریک بکەین.

لەمێژ ساڵە هەر لەو کاتەڕا فامان کردوەتەوە باوباپیرانمان مانایەکیان لە دڵ و مێشک چەسپاندووین و تام و چێژەی ئەومانایان لەبنی ددان رۆکردووین. ئێستا کە هەموومان، چ پیر

چ لاو ، چ ژن چ پیاو ،دێنشین و خەڵکی شار خوێندەوار و نەخوێندەوار ،لەژێر دەسەڵاتی حاکمیەتی مەعنەوی فەرهەنگێکی هاوبەشدا ین ، هیچ پێویست ناکا لەسەر ئەم تەعبیرە کە هەموومان وەک یەکی بۆ دەچین بڕوێین . تەنیا مەبەستمان ئەوەندەیە ژەنگ و ژواری فەرامۆشی لەسەر ئاوێنەی دڵمان بسڕینەوە و خۆمان وەبیر بێنینەوە . ئەو ژەنگەی کە بە درێژایی مێژوو لەسەری نیشتووە و لە زۆر جێگا بۆتە هۆی رێ هەتڵە بوونی میللەتان و کاڵ بوونەوەی رەنگی فەرهەنگەکەیان تا جێگایەک کە کەسایەتی نەتەوایەتی و ئینسانی و دینی خۆیان لەدەست داوە و بەوەی کە بوویان ناناسرێنەوە .

**ئەرکی قەڵەم و قەڵەم بەدەست ئەوەیە کە تابلۆیەکی دروست لە واقیعیەت بکێشێتەوە و لە پەنای ئەودا حەقیقەتی مەکتەب و فەرهەنگی رەسەنی هەر میللەتێک نیشان بدا ، کە ئەوەش دەستەبەری سەربەخۆیی هەر نەتەوەیەکە .**

**نووسەری ئێمە دوو ئەرکی گرینگی لەسەر شانە ، لە لایەک دەبێ پڕ و پووچی ، دزێوی و بێبایەخی ئەوخوو و خدە و ئاکارانەی کە دەستکردی فیکر و خەیاڵە باتڵەکانی داسەپاوی بێگانە و نەفسی ئەممارەی دەروونی خۆمان نیشان بدا و لە لای ترەوە پەردەی فەرامۆشی لەسەر نرخ و پلەی واقیعی بایەخە رەسەنەکان هەڵداتەوە و بە بووژاندنەوەی فیترەتی پاک و خاوێنی ئینسانەکان جم و جوولێک بخاتە ئەندامی سست و بێهێزی کۆمەڵوتوولە نەمامی ژیانی کۆمەڵ لە گێژە لووکەی خەیاڵاتی باتڵ رزگار بکا .**

لێرەدا دەردەکەوێ کە جەوهەری قەڵەمی زانا لە خوێنی شەهید پڕبایەخترە . ئەگەر خوێنی شەهید ناپاکی دەسڕێتەوە ، خوێنی قەڵەم جگە لەوەش پاکی دەخولقێنێ. خوێنی قەڵەم خوێنێکی گەش و پاک داژوێتە دەماری کۆمەڵ ، هەرکات پێویست بێ بۆ دیفاع لە شەرافەت و ئینسانیەت ، پاکی و سەداقەتە برایەتی و عەدالەت ، چەوساوە و زۆر لێکراو ، بەکورتی بڵێین لە هەموو بایەخە رەسەنەکانی ئینسانی و مەکتەبی خۆ تەیار دەکا . ئەڵبەت هەروەک لە ژمارەی پێشوودا گوتمان تەنیا مەرجی گەیشتن بەو ئامانجە تەعەهودی قەڵەمە ،دەنا لە دونیای ئیمڕۆدا بە میلیۆن و بە میلیارد قەڵەم بەسەر لاپەڕەی کاغەزدا دەگەڕێ و جگە لە گەمە پێ کردن و خافڵاندن و لەخەوکردنی خەڵک چی دیکەیان نەکردووە .

**بە کورتی دەبێ سنووری تەعەهود و بێ قەیدی بناسرێتەوە و شێوەیەکی ئوسوولی و لەبار بۆ ناساندنی دیاری بکرێ .**

ئەم باسە بەرێکی درێژی هەیە و لەم ژمارەدا ناتوانین لەمە زیاتر لەسەری بڕۆین ، هیوادارین بتوانین لە ژمارەکانی داهاتووشدا درێژەی ئەم زنجیرە باسەتان پێشکەش بکەین .

لێرەدا لە درێژەی باسی پێشوومان لەسەر پێویستی کوردیبوون و ئەدەبی ـ فەرهەنگی بوونی "سروە" بە پێویست دەزانین چەند مەسەلەیەکی دیکەش بێنینە گۆڕێ ، تا بەڵکوو بە هاوکاری و هاوفیکری ئێوەی بەڕێز لە رێگایەکی باشتر و کورتترەوە بە ئاکامێکی دڵخوازتر بگەین . دڵنیاین کە بە یارمەتی خودای مەزن و رێنوێنی ئێوەی خۆشەویست بەو ئامانجە دەگەین .

وێڕای سوپاس لەو خۆشەویستانەی کە بە پشت گرتن و بەرەو پێش هاندانی ئێمە و هەروەها بە رەخنە و پێشنیاری بەجێ و بە کەڵک بۆ پێشکەش کردنی گۆوارێکی پڕ نێوەرۆکتر دڵگەرمیان کردووین ، بۆ دەربڕینی رێز و حورمەتی خۆمان بەرانبەر بەو هەموو پەیامە گەرم و

گورانەی کە لێکدا لێکدا بەرەورووو یا بە نامە و تەلەفوون دەگەیشتنە دەستەی نووسەرانی سروە ،بە باشمان زانی چەند خالێکی گرینگ لەسەر ئەو پرسیار و پێشنیارانەی هاتبوونە گۆڕی، روون بکەینەوە :

دەستەیەک لە خوێنەرانی بەڕێزی سروە ویستوویانە لەسەر بابەتەکانی کۆمەلایەتی، ئابووری و ...یش بنووسرێ ، لە وەلامدا دەبێ عەرزتان بکەین کە :

**لە حالی حازردا بۆمان ناگونجێ هەموو پێداویستییەکان دابین بکەین.بەلام سەرەڕای بەرتەنگی لاپەڕەکانی گۆوارەکەمان تێدەکۆشین بەرەبەرە بەهێنانە گۆڕی ئەو باسانە ویست و داخوازی ئەم خوێنەرە بەڕێزانە بەجێ بێنین ، هەلبەت لە گەلالەی درێژ خایەنی خۆماندا پاشکۆی تایبەتی مندالان ، مێر مندالان،ژنان ،ئابووری ، ئاینی و ...مان دەبێ، کە بە مەرجی هاوکاری ئێوە دەست بە بلاوکردنەوەیان دەکەین . ( انشاءا ...)**

دەستەیەکی دیکە لەو بەڕێزانە داوایان کردبوو کە لە گۆوارەکەدا بە لەهجە جۆراوجۆرەکانی کوردی شت بلاو بکرێتەوە تا بەم شێوەیە هەموو بتوانن کەلکی لێ وەرگرن .لە وەلامدا دەلێین: **ئێمەش وەک زوربەی ئەدیبەکان بڕوامان بە یەکەتی زمانی ئەدەبی کوردی هەیە ،هەر بەم پێو شوێنە تا ئەو دەم کە کۆنگرەیەکی ئەدەبی۔ فەرهەنگی پێک دێ و رای زوربەی قسەزانان و پسپۆڕانی ئەدیبمان دێتە دەست ،ئێمە لە لەهجەی نێوەراست کەلک وەردەگرین، دیارە تێدەکۆشین لە هەر ژمارەیەکدا چەند شیعر و باسی فۆلکلۆری جنووب و شمال بە لەهجەی تایبەتی خۆی بلاو بکەینەوە .**

**روونە کە ئەم کارە تەنیا لەبەرویست و داخوازی خوێنەرانی سروە نیە ،بەلکوو بەڕاستی بە پێویستی دەزانین چون لە لایەک سەرنج دانە بە ئەدەبی عامیانەی تەواوی مەلبەندە کوردنشینەکان و لەلای دیکەشەوە جوانی و رێک وپێکی و پوخت و پاراوی هەموو لەهجەکانی کوردی دەپارێزێ.**

ئەم باسە لە بابەت رێنووسیشەوە بەدی دەکرێ. سەرەڕای ئەوە کە لە ژمارەی پێشوودا چۆنیەتی پێویستی ئەم رێنووسەمان راگەیاندووە و زوربەی ئەدەبدۆستان و مامۆستایانیش پشتیوانییان لێکردووە ، دیسان هێندێک لە خوشک و براکان لەسەر ئەم مەبەستە پێ دادەگرن کە نووسراوەکانیان بە شێوە نووسینی تایبەتی خۆیان چاپ بکەین،ئەم کارە سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ و یەک پارچە بوونی گۆوارەکە تێک دەدا ئێمە لەو بارەدا ئەزموونێکی تالمان هەیە کە نامانەوێ دووپاتی بکەینەوە.

**ئێستاش بەپێی راونەزەری گشتی خوێنەرانی سروە، هەروا بەم رێنووسە نووسراوەکان چاپ دەکەین . بەلام ئەوەش رادەگەیەنین کە ئەگەر بێتوو چەند وتاری بەڕێ وجێمان بگاتە دەست کە چەند نەزەری تایبەتی لەباری رێنووسەوە تێدا بێ،جێگایەکی تایبەتی لە گۆوارەکەدا بۆ لەبەر چاو دەگرین .تەواوی بیر و ڕا جۆراوجۆرەکان کۆ دەکەینەوە و رایان دەگرین بۆ ئەو کاتەی کۆنگرەی ئەدەبی پێک دێ.**

**بەو هیوایەی توانیبمان ئەم مەبەستە بە جوانی روون بکەینەوە .**

لەسەر وتاری ژمارەی پێشوودا رچەمان شکاند بۆ چاپی وتاری تەحقیقی و... بەزمانی فارسی. ئەم باسە پێشوازییەکی شایەنی باسی لێکرا بە تایبەتی لە لایەن ئەوانەوە کە بە تەواوی شارەزای خوێندن و نووسینی زمانی کوردی نین ، لێرەدا ئەم مەبەستە رادەگەیەنین : **کە ئەم خۆشەویستانە تەنیا چاویان لەوە نەبێ کە چەند**

وتاری فارسیان بۆ چاپ بکرێ، دەبا قەدەرێک خۆ ماندوو بکەن و تێبکۆشن و زمان و ئەدەبی نەتەوەی خۆیان فێر بن .لەو کاتەدا دەتوانن لە تێکڕای بابەتەکانی گۆوارەکەش کەڵک وەربگرن .

هاوکات لەگەڵ پێشنیاری ئەو ئازیزانە کرایان لەسەر ئەمەیە سەروتار بە کوردی بێ پێویستە رابگەیەنین کە ئێمەش رەخنەمان لەوە هەیە و لەسەر ئەم باوەڕەین کە سەروتاری گۆوارێکی کوردی دەبێ بە کوردی بێ . جا هەر بەم پێوشوێنە و هەر وەها لەبەر ئەو دەستە لە خوشک و برایانی کورد کە فارسی نازانن، سەروتارمان بە هەر دووک زمانی فارسی و کوردی لە چاپ داوە تا هەموو لایەک بتوانن کەلکی لێ وەربگرن .

لە کۆتاییدا شوکری خودا تەواو ناکەین کە ئێوەی خۆشەویست ئاوا دلسۆزانە بەرەو پیرمان هاتوون،ئێمە دیسان دەستی یارمەتی بۆ لای ئێوە درێژ دەکەین ، چون لەسەر ئەم بڕوایەین کە بێ یاریدە و پشتیوانی هەموو لایەنەی ئێوە ،ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانە ئاکامی نابێ و ئەم سروەیەش دەکەوێ.جا کە وابوو لێرەدا دیسان دووپاتی دەکەینەوە کە سروە پێوەندی بە هیچ چین و توێژێکی تایبەتی‌یەوە نیە ولە تەواوی چینە جۆراوجۆرەکانی خەڵکی موسڵمانی کورد بە تایبەتی عولەما و مامۆستایانی پایەبەرزی ئایینی،ئەدیبانی خاوەنڕا و فەرهەنگی‌یە بەڕێزەکان و خوێندکارانی زانستگاکان و قوتابیانی بەڕێز بە کورتی ئەدەبدۆستانی شارەزای فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی چاوەڕوانی هاوکارین.

" سروە " سروەی خۆتانە و بەهی خۆتانی بزانن و بە سەرنجەوە بڕواننە نێوەرۆک و شکڵ و تەرح و قیمەت و... بە کورتی لەهەر بارێکەوە کەم و کووریتان پێ شک دێ بە رەخنە و پێشنیار پێمانی رابگەیەنن ، کە دەبێتە هۆی دڵگەرمی و هەوێنی هومێد و هیوای نووسەران و کاربەدەستانی سروە بو دارشتنی گەڵالە بەنرخەکانی دیکە و هاندانیان لە رێگای خزمەت بە فەرهەنگی پاراوی کوردی.

خۆشی و بەختەوەریتان لە خوای میری مەزن ئاواتە خوازین.

دەستەی نووسەران

# سرمقاله

**با سلام به خوانندگان عزیز مجلهٔ " سروه "**

از نظر تمامی افراد اندیشمند و صاحب فکر، در اینکه گمراه ساختن از کشتن قبیح تر و هدایت از زنده ـ ساختن ارزشمندتر است، هیچ تردیدی وجود ندارد، روشن است که بر این اساس کمک به در راه‌ماندگان و گم‌گشتگان و یاریشان درطی طریق سعادت و رسیدن به وادی ایمن، امری بس والا و پسندیده و مرضیّ خاطر خالق و خلق است وآرام بخش درون متلاطم بی انتها طلب و سینه عطشان آزادگان .

هرچند که در تفسیر سعادت ممکن است اختلاف نظر ( حتی اساسی ) و آنهم تا بین دانشمندان بزرگ وجود داشته باشد که دارد، لیکن خود را درگیر این مقوله نمی‌کنیم ، چراکه مردم ما ، پیران زحمتکشیدهٔ ما، از اولین لحظاتی که فهمیدن آغاز کردیم ، تفسیر آنرا در گوشمان زمزمه کرده و حقایق برینی را با گوشت و پوست و استخوانمان درآمیخته‌اند... و خلاصه اکنون که در قلمرو نفوذ و حاکمیت معنوی‌فرهنگی واحد ، قرار داریم ، لزومی به طرح بحثی که تفسیر آن

وجه مشترک اعتقادات همگی ما ، از پیر و جوان ، زن و مرد روستائی و شهری، تحصیلکرده و درس ناخوانده است ،نمی‌بینیم آنچه اکنون مورد نظر است تنها تذکر و یادآوری و زدودن زنگار غفلت و فراموشی از آئینهٔ تمام نمای دل است. همان آفتی که فراز و نشیب تاریخ و تنش زمان،بعضا تا مرز انحراف و خودباختگی فرهنگ و هویت ملی،انسانی و دینی قومی را دستخوش تغییر و دگرگونی می‌سازد .

**رسالت قلم بدستان قوم در اینستکه با تصویر کردن واقعیات در کنار ترسیم حقایق فرهنگ و مکتب و تشریح هویت اصیل فرهنگی که بی‌شک شخصیت مستقل ملی را ( تا مرز حفظ مفهوم مرز ناشناس انسانگرائی ) متضمن است ، جامعه را آگاهانه به پیراستن این غبارها دعوت نماید و با بیدار ساختن فطرتهای پاک و سالم ، از طریق تبلیغ ارزشهای اصیل و تاکید بر قبح ضد ارزشهای خانه‌زاد نفس و اندیشه‌های تزریقی و تحمیلی بیگانگان، جهشی در اندام بیمار گونه اجتماع افکنده و کشتی توفانزدهٔ حیات را به ساحل سلامت و پاکی رسانند .**

بدین جهت بروشنی می‌توان افضلیت مداد دانشمندان بر خون شهدا را دریافت .چراکه خون قلم هم نافی ناپاکیهاست و هم خالق پاکیهاست و این خون قلم است که خونهای پاکی را در رگها بجریان می‌اندازد، تا گام لزوم و ضرورت ، از انسانیت و شرف ، پاکی و صداقت ، صفا و اخوت،مظلومان و ضعفاء و خلاصه تمامی ارزشهای اصیل انسانی و مکتبی دفاع نماید. البته همچنانکه در شمارهٔ قبل یادآوری گردید، نیل به هدف فوق تنها به شرط تعهد قلم است وگرنه امروزه میلیونها قلم بر صفحات میلیاردها برگ کاغذ می‌رقصند تا مردم را بر صفحهٔ گیتی برقصانند، بخوابانند و بمیرانند.

**فی‌الجمله باید مرز تعهد و بی‌قیدی را بازشناخت و شیوهٔ اصولی و متقن کاربرد آنرا بازشناسانند....**

نظر به تفصیل بحث از یکسو و محدودیت درج مطالب در نشریه،ادامهٔ بحث را بصورت سلسله‌وار در شماره‌های بعد ،ادامه خواهیم داد.

اکنون در ادامهٔ بحث ضرورت کردی وادبی-فرهنگی بودن " سروه " لازم می‌بینیم تا پاره‌ای دیگر از مسائل را با شما خوانندگان عزیز درمیان گذاشته، باشد که از این رهگذر با طی رهی کوتاهتر به کیفیت ایده‌آل در طرح مطالب و نتایج مطلوب نائل آئیم . چه اعتقاد راسخ داریم ، با اتکال به امداد الهی و راهنمائیهای شما عزیزان تحقق این امر حتمی خواهد بود. در اینجا ضمن تشکر از همه عزیزانی که با تقدیر و تشکر و نیز انتقادات و پیشنهادات خود ما را در ارائهٔ کیفیت برتر دلگرمی و امید بخشیدند ، یادآوری می‌کنیم که نظر به احساس مسئولیت و احترام و علاقه خود نسبت به سیل پیامهای تلفنی ،نامه‌های کتبی و راهنمائیهای حضوری خوانندگان گرامی مناسبتر دیدیم تا حول نقطه نظرات ، تاکیدات و سوالات مطرح شده ، نکاتی را روشن سازیم :

گروهی از خوانندگان محترم ، ضمن اظهار علاقه از چاپ مجلهٔ "سروه" خواسته‌اند تا مباحثی را به زمینه‌ها و موضوعات مختلف دیگر اجتماعی، اقتصادی و .... اختصاص دهیم. باین دسته از عزیزان باید عرض‌کنیم که :

**در حال حاضر امکان برآورده ساختن تمامی انتظارات برایمان مقدور نیست . لیکن علیرغم محدودیت صفحات نشریه تلاش خواهیم کرد بتدریج با طرح مباحث مفیدی بدعوت این دسته از برادران و خواهرانمان**

پاسخ مثبت دهیم . مضافا باطلاع میرسانیم که در برنامهٔ دراز مدت خود، طرح ضمیمه‌های ویژه‌ای در موضوعات مختلف کودکان ، نوجوانان ، زنان و اقتصادی ـ مذهبی و... را در نظر داریم ، که در صورت فراهم آمدن امکانات لازم و همکاریهای شما عزیزان ،بدان اقدام خواهیم کرد (انشاءا...).

جمعی از عزیزان نیز تقاضا کرده بودند که در نشریه از لهجه‌های مختلف کردی استفاده شود تا بدین ترتیب همگان بتوانند بنحو احسن از مطالب نشریه بهره‌مند گردند ، در این رابطه متذکر می شویم که :

ما نیز همانند بسیاری از ادبا به وحدت در لهجهٔ کردی معتقد بوده و بر این اساس تا تعیین لهجه ادبی کردی که قطعا میباید در یک کنگرهٔ ادبی ـ فرهنگی و با اکثریت آراء ادبا و سخندانان کرد محقق گردد ،از لهجهٔ میانی استفاده کرده‌ایم .البته سعی کرده و میکنیم که در هر شماره قطعاتی از اشعار و یا مباحث فولکلوریک جنوب و شمال را با لهجهٔ ویژه‌اش بچاپ رسانیم. روشن است که وجه اخیر نه بخاطر تقاضای " سروه خوانان " ارجمند و بلکه برا اساس دو ضرورت است ، نخست ضرورت توجه به ادبیات عامیانهٔ تمامی مناطق کردنشین و دیگر ضرورت حفظ ایجاز و بلاغت ، زیبایی و فصاحت ، مفاهیم سمبلیک و اصطلاحات منحصر بفرد هر نوع از لهجه‌های کردی . همین بیان در خصوص رسم‌الخط نیز جاری است و علیرغم آنکه در نشریه قبل ضرورت رسم‌الخط واحد را متذکر شدیم و بسیاری از ادبدوستان نیز از این موضع حمایت و تقدیر کرده‌اند، لیکن بعضی از دوستان اصرار دارند که مطالبشان را با رسم‌الخطهای خاص خود (که خواننده را با مشکلات زیادی مواجه و زیبایی و یکپارچگی نشریه را از بین می‌برد) چاپ نمائیم .

با توجه به نظرخواهی صورت گرفته از علاقمندان سروه کماکان مطالب را با رسم‌الخط فعلی چاپ کرده باطلاع میرسانیم که در صورت ارسال مقالاتی که بطور منطقی و مستدل نقطه نظرات خاصی را در مورد رسم‌الخط بیان دارد ، ستون ویژه‌ای را برای این امر منظور میداریم ، تا هرگونه بحث لازم در این خصوص ، در جای مشخص خود عنوان گردد ، بدیهی است رسم الخط کردی قطعی نیز باید از سوی کنگرهٔ مذکور معین گردد . امید است توضیحاتمان مقبول افتد.

" سرمقاله" شمارهٔ قبل پیرامون بازبودن باب چاپ مقالات تحقیقی و ...بزبان فارسی در " سروه "بحث شد. این امر با استقبال برادران و خواهران کردی که هنوز به ادبیات و خاصه نوشتن و خواندن کردی تسلط لازم را ندارند روبرو گردید. در اینجا تذکر میدهیم که :

این دسته از عزیزان باید در فراگیری زبان و ادبیات تلاش بیشتری بخرج دهند تا بتوانند از مجموع مطالب نشریه استفاده کرده و تنها به معدود مقالات فارسی که در صورت ارسال از سوی خوانندگان بچاپ میرسد اکتفا نکنند . همچنین لازم است در رابطه با پیشنهاد عده‌ای از عزیزان کردی بودن سرمقاله عرض کنیم که ما نیز اعتقاد داریم که سرمقاله نشریهٔ کردی باید بزبان کردی باشد . براین اساس و نیز بخاطر بهره‌مندی برادران کردی که فارسی نمی‌دانند در این شماره سرمقاله را بهر دو زبان کردی و فارسی چاپ کرده‌ایم تا همگان را سودمند افتد.

در پایان باردیگر در راستای استعانت از خدای

← ص ۹۸

# ماموٚستا سەید تاهیری هاشمی

# بوٚ سروەی ئازیز

نووسەران و کاربەدەستانی سروە بە پیر و لاوەوە خوٚیان سەربەرز دەزانن و شانازی بە کارەکەیان دەکەن، کە ماموٚستایەکی وا پیر و دڵتەڕ، وا پاک و خاوێن، وا دڵسوٚز و نیشتمانپەروەر بەسەری کردوونەوە.

سەید تاهیری هاشمی ئەم کوردە مەزنەیە کە لەوەتی دەستی قەڵەمی گرتووە، بوٚ بردنە پێش و پەرەدانی ئەدەب و فەرهەنگی کوردی تێکوٚشاوە و هەوڵی داوە و سەدریش کەوتووە. ئێستاش وازی نەهێناوە و ئەوەتا لاپەڕەکانی "سروە"ی رازاندوٚتەوە.

هیوادارین خوای مەزن سێبەری ئەم پیروٚزە خوٚشفەڕەمان لە سەر کەم نەکاتەوە.

ئەریٚ سروەکەی تەوس لە دڵ دەرکەر
بوٚی سمڵ و مێخک یەخەی دڵبەر دەر

بەربەیان لە زلف یاران تیٚ پەڕیو
عەتری شەمامە و کالەبەی کڕیو

نەفەس عەنبەر بێز بوٚی مشک خاڵان
هاوڕیٚ لەگەڵ ناز ملْقی منداڵان

ڕێی بەروٚک گرتوو هێمن بە کەم کەم
سەر کێشا و لە گەنج لیمو و سینەوەمەم

هاوڕاز تووڕەی گەردن بیٚ گەردان
هەتای عەبیرین سارا و سەر هەردان

کڵاو ئەوکڵاو راخ و زاخ و شاخ
لە بوٚی هەناسەت یەکسەر وەپەرداخ

ئارامی دڵان گیان ئەفزای گیانبەخش
چڵە پوٚپەی دار لە هاژەت نە لەخش

قاسپەی سوێسک و کەو، چریوەی مەلان
مەستی و پیرەی شوٚخ نێچیری بەلان

پارێزی چالاک نێچیروانی شەنگ
وەبیٚ خشپەی پیٚ نیهان لە سای سەنگ

شنوٚی شادی و شەوق بیٚ بایی و هەرزان
سڵەوینەوەی کەڵ لەسەر بەرزان

هەموو بە هەوای هیوای تاسەتە
لە بوٚنەی شادی بوٚی هەناسەتە

سروە! چەن هاوین گەرمم رابوارد
ئاوی تاڵ و سوێر بن شیوانم خوارد

هوڕە و مێشوولە و توٚفانە و شەوکەز
بە سەرما بارین بیٚ پەروا و نەبەز

مەپرسە لە نێش زەنگنە وە مەی شەو
نەی دەهێشت بچیٚ نەچاوانم خەو

هەتاکوو گەیی تەمەن بە پیری
سەری هەڵدالیم زاری و زویری

نەکا بێنی خوٚش توٚ چوو بە سەرما
جوانی لە نویٚ هاتوٚ بە بەرما

لە بیرم نەما ژاراوانی تاڵ
فراق فراموٚش شیرینی وساڵ

باری پەژارە لە شانم داکەوت
راستیم دییەوە لە زەمانەی چەوت

گوڵی ئارەزووم رووی نواندەوە
توٚوی ئاواتم لە دڵ چاندەوە

خەم و مەینەت و سەخڵەت بوون بەرباد
دڵ شاد، لاشە شاد، ڕوٚح شاد، سینە شاد

یاخوا بەخێر بێی مایەی ژیانم
هێمن هێمنی، بەسەر چاوانم

زوو زوو بیٚ و، بێنە بوٚ چاوانی من
جەواهێر سورمەی توٚزی پێی هێمن

٨ ١٧/ ٥/ ١٣٦٤

# پێشوازی زانایان و ئەدەبدۆستانی کورد لە سروە

خودا یاریدەی داین . نەمردین و بە ئاوات گەیشتین . سروە هاتە دەر . دیاری یەکی خۆمالّی بوو . خەڵک بەرەو پیری هاتن . پێشوازیان لێ کرد . مامۆستاکان ، زاناکان ئەدەبدۆستەکان پشتیان گرتین . ڕێنوێنی یان کردین . نووسەرەکان لەسەریان نووسی ، شاعیرەکان خزینە سووچێکی ئارام و بێدەنگ شیعریان بۆ دانا .هونەرمەندی بەردبڕ ئارمی سروەی بۆ هەڵکەندین . ئەوانەی لە دەرەوەی وڵاتیش ناویان بیستبوو نامەیان بۆ ناردین ، ئەوە گەورەترین پاداشی نزیک بە شەش مانگ حەول و تەقەلای دەستەی نووسەرانی سروە بوو . ئەوە ئێوە و ئەوەش بەشێک لە پێشوازی زانایان و ئەدەبدۆستانی کورد لە سروە .

بەشێک لە پەیامی مامۆستا مەلا ڕەشیدی قەرەنی زادە

ئیمام جومعەی مەهاباد

بەناوی پەروەردگاری زانا و توانا دوای سوپاس و ستایشی کردگار شادم لەوەی بۆ یەکەم جار گۆواری "سروە" لە ئەدەب و فەرهەنگی کوردیدا دەبینم .

... بە هەر حاڵ خۆش بەختیتان و هەروەها لەو کارە چاک و پاکەدا سەرکەوتنتان ئاوات خوازم ..

SERKETİNA MİŞKAN

Meselokên lawiran IV

Wêne: Ahmet Cantekîn

© 1984 M. Emîn Bozarslan

M. Emîn Bozarslan

University of Illinois
at Urbana-Champaign

A. Hassan Aghdam

Institute of
Communications Research

College of Communications

222B Armory Building
505 East Armory Avenue
Champaign
Illinois 61820
USA

217 333-1549

A. Mardukh ,
Paris , France

بعد از سلام و دست بوسی استادان عالیقدر و کوشا و محبوب مجله ( سروه )، توفیق همه شما را در ایجاد اینگونه کارهای هنری و فرهنگی ارجمند از خداوند خواستارم . شماره ٤ مجله سروه را دریافت نمودم و بسیار خوشوقت شدم . از اینکه این با بضاعت بامقدار را بیاد آورده‌اید بسی سپاسگزارم . ولی چون بواسطه پیری و رنجوری توانایی مطالعه و نوشتن سابق را ندارم ، فقط بعنوان عرض تبریک و تشکر از بنده خودتان قناعت بفرمایید . اگر حوصله داشتم نظریه خود را تقدیم و هر خدمتی که از دستم برآید مضایقه نخواهم نمود و اگر نتوانستم معذورم دارید . والعذر عند کرام الناس مقبول . اگرچه با وجود استادان دانا و مجرب زمن هیچ آوازی نباید که منم . نامه‌ام را بدین وسیله بفارسی نوشتم که قلم در دستم فعلاً باین زبان روانتر بود . موفق و سرافراز باشید .

قربانتان [illegible] از سنه کردستان

٦٤/٤/١٩

تەورێز : کاک قادری فەتتاحی قازی

... بە بۆنەی دەرچوونی گۆوارە جوانەکەتان ، گۆواری سروە ، لە بەڕاستی ناوەکەشی زۆر خۆشە ، لە قووڵایی دڵەوە پیرۆزبایی‌تان لێ دەکەم ، هیچ چاوەڕوانی نەدەکرا لە هەوەڵی کاری، گۆوارێکی وا جوان و رێک و پێک دەربچێ . ئومێدەوارم هەتا هەتایە گۆواری سروە بەرقەرار و راوەستاو بێ

قوم : خوشکە سروە بێکەس کوردی

...زانیومە نەک دیومە ..... گۆواری (ئەدەبی ـ فەرهەنگی سروە ) بە زمانی کوردی کەوتۆتە بازاڕەوە،ئومێدەوارم ئەم گۆوارە وەک ناوەکەی سروەیەک بێ بۆ ژیانەوەی ئەدەب و فەرهەنگ و مێژووە شاراوەکەی گەلەکەمان.

مەهاباد : کاک ئەحمەدی بەحری

پاش چاوەنواڕی‌یەکی زۆر لە حەندە حەندی خەم و خەفەتدا ، ئەو کاتەی کەتینی تەوژمی خۆ لەبیر چوونەوە برستی لێ بڕیبووم " سروە " وەهانام هات و سوکنایی خستمە دڵ .

لە شایان بزم هاتێ و شانم بۆ هەڵتەکاند. لووشمەی سەر لێوم بارگەی تێک ناو کەس نەیگێڕاوە . چاوە برسی‌یەکانم دێڕ بە دێڕی نووسراوەکانیان وەرد داوە و کاسەی تاسەی تامەزرۆیی‌یان پڕ کردم و تینوویەتی‌یان شکاندم . هەوری گەواڵ گەواڵ کۆ بوونەوە و بەختە بارانەی بەهاری کێڵگەی رووتی بێ حاسڵیان ژیاندمەوە...

بروجرد : کاک مەسعوودی پاک نەهاد

بە بیری من سروە یەکەمین گۆوارێکە کە پاش شۆڕش ، بەم شێوەیە و بەم نێوەرۆکەوە بڵاو دەبێتەوە .

بوکان : کاک سمایلی قاسمی(هیوا )

بەڕاستی نازانم چۆن هەستی خۆم سەبارەت بە دەرچوونی ئەم گۆوارە بە نرخە ( سروە ) دەربڕم، کاتێکی سروەم بە شووشەی کتێب فرۆشی‌یەکانەوە دیت و بە تایبەتی کە دیتم لێی نووسرابوو ئەدەبی ـ فەرهەنگی هەر ئەوەندە بوو لە خۆشیان باڵم نەگرت و نەفڕیم . بەڕاستی ون بووی چەند ساڵەم بوو کە دیبوومەوە و ئەوەی لە عاسمانانی لێ دەگەڕام لە عەرزیم وەگیر کەوت ....

سنە : کاک فەرەیدوونی

مەحموودی سروە بڵێسەی ئاوری هیوا و ئاواتی گەلەکەمانە ، کە وابوو دەبێ هەموومان لە ناخی دڵەوە تێبکۆشین و نەهێڵین ئەم کۆرپە ساوایە بەر لەوەی بە ئاواتی بگا بمرێ و وەجاخی فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوەکەمان کوێر ببێتەوە .

چیە ئەم بایە وا فێنکی دڵانە
هەوێنی نەوبەهاری بولبولانە

زڕەی زەنگی سەلاحەددینی گوردە
ومیا " سروە"ی شەماڵی خاکی کوردە؟

چیە ئەم "سروە" وا دڵپێی گەشاوە
گەڤەی وەک عوود و بێنی وەک گوڵاوە

مەکۆی دڵدارەکانی دڵبرینە
هەوایی شیعرە ، بەزمە ، پێکەنینە

شنەی با بۆچی هێندە دڵفەریحە
نەخێر ئەو سروە چەشنی فووی مەسیحە

خودا ئەم سروە تۆ نەبڕی لە دڵمان
بدا تین بۆ هەناوی پڕ لە کوڵمان

دەبا "ئاسۆ" لە زەلکاوی تەم وبەند
وەدەر بێنێ بەرەو بەحری هونەرمەند

## چەند خاڵێکی گرینگی‌تر لەسەر ڕێنووسی کوردی

١ ـ بە هاتنە سەرکاری کەمالیستەکان لە تورکیا و هاوکات دەگەڵ هەوڵدانی ڕەزا خان بۆ سڕینەوەی فەرهەنگی ئیسلامی و نەتەوایەتی لە وڵاتی ئێراندا ، کە لابردنی حیجاب ، قەدەغە کردنی لیباسی کوردی و پەرەدان بە فەرهەنگ و داب و دەستووری غەرب لە ئێران و تورکیا دا نموونە و بەرهەمێکی ئەو ئیستیعمارە فەرهەنگی‌یە بوو ، لە تورکیا بە پێی قانوون دەبوو بە زمانی تورکی بانگ بدەن و نوێژ بکەن ، و ئەلف و بێی عەرەبی یا باشتر بڵێین ئیسلامی کە هەموو وڵاتانی ئیسلامی لە وڵاتە عەرەبی‌یەکانەوە بگرە تا تورکیا ، و ئێران و ئەفغانستان و پاکستان بەو خەتەیان دەنووسی جێگای خۆی دا بە ئەلف و بێی لاتین کە ئەویش تەئسیرێکی فەرهەنگی ئیستیعماری غەربە لەو وڵاتە دا. ئەو کارەش تەئسیری کردۆتە سەر ئەلف و بێی کوردی لە نێو کوردەکانی تورکیا دا . هەر چەند کە خوێندن بە زمانی کوردی و تەنانەت قسەکردن بە زمانی زگماکی کوردی بۆ کوردەکانی تورکیا قەدەغە بووە و ئێستاش هەر قەدەغەیە ، بەڵام ئەگەر بۆ نەهێشتنی ئەم زوڵمە و خزمەت بە زمانی کوردی هەوڵێکیش درابێ ، بە ناچار هەر لە ئەلف و بێی لاتین کەلک وەرگیراوە ، چونکوو هەم خوێنەر و هەم نووسەری کوردی تورکیا بە ئەلف و بێی لاتین شارەزا بووە .

جگە لە تورکیا ، کوردەکانی یەکەتی سۆڤیەتیش کە سەرەڕای کەم بوونی ژمارەیان توانیویانە بە زمانی زگماکی خۆیان دەرس بخوێنن ، بە ناچار لە ئەلف و بێی رووسی کەلکیان وەرگرتووە .

لە رابوردوودا زۆر جار هەوڵ دراوە کە لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیشدا ئەلف و بێی لاتین لە جێگای ئەلف و بێی عەرەبی دابنرێ . کە تا ئێستا سەرنەکەوتوون

**بۆچی پێمان وایە دەبێ کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی بنووسین ؟ :**

**یەکەم :** لەگەڵ ئەوەی کە ساختمانی بەدەنی هەموو ئینسانەکان وەک یەک خوڵقاوە و هەموو وەک یەک دوو چاو و دوو گوێ و کەپۆیەک و .. مان هەیە ،بەڵام عەوامیلی دەور و بەرمان و ئەوزاعی جوغرافیایی و ئیقلیمی ئەو جێگایانەی تێدا دەژین ، کار دەکەنە سەر هەڵکەوتنی ئەندامەکانی لەش و لە هەر ناوچەیەکدا نیژادێکی تایبەتی ( رەش ، سپی ،.. ) پەیدا دەبێ .

هەر وەک ئەستووری و رەنگی پێست و رەنگی قژ و شکڵی لێو و چاوی ئینسان بە

پێی مەڵبەندی جوغرافیایی دەگۆڕدرێ
باریکی و ئەستووری ژێیەکانی دەنگیش لە هەموو ئینسانەکاندا وەک یەک نیە ، باری پێچ و پەنا و رەهۆڵەکانی ناو گەرووی ئینسانیش ( مخارج حروف ) کە تەئسیر دەکەنە سەر لەرینەوەی دەنگ ، لێک جیاوازن و دەبینین دەنگی وا هەیە کە تایبەت بە زمانێکە و لە زمانەکانی دیکە دا نیە . لەگەڵ ئەوەش کۆمەڵە زمانی وا هەن کە دەنگەکانیان لێک نزیکترن ،زمانی کوردیش لەبەر تێکەڵاوی لە مێژینەی کوردەکان لەگەڵ هاو وڵاتانی عەرەب و فارسی خۆی و هاوبەش بوونیان لە زۆر وشەو زاراوەدا بەم زمانانە نزیکترە و لە زمانی ئورووپاییەکان دوورترە . زۆر دەنگی وا هەن کە لە زمانی کوردیدا هەن و لە زمانە ئورووپاییەکاندا نین ، پێچەوانەکەیشی هەر دروستە . هەر بۆیەش نووسینی زمانی کوردی بە ئەلف وبێی لاتین تەنگ و چەمەڵەیەکی زۆرتری لە پێشدایە و بێ گۆمان یەکێک لە هۆیەکانی سەرنەکەوتنی ئەو هەوڵدانانەی باسمان کردن هەر ئەمە بووە.

**دووەم :** بە تایبەتی لە کوردستانی ئێران و عێراقدا بەرهەمێکی ئەدەبی و فەرهەنگی کوردیمان نیە کە بە رێنووسی لاتین نووسرابێ تاکوو سەرنجمان بۆ لای فێر بوونی ئەو رێنووسە رابکێشێ .

**سێهەم :** تا ئێستا شوێنەواری زوربە و بگرە هەموو شاعیران و نووسەرانی کوردی ئێران و عێراق هەر بە ئەلف و بێی عەرەبی چاپ و بڵاو کراونەوە ،کە گۆڕینی ئەو شوێنەوارە بە نرخانە بۆ سەر رێنووسی لاتین کارێکی ئاسان نیە و ئەگەر نەشیانگۆڕین خوێنەرانی داهاتوو بە تایبەتی بەرەی لاو و مێرمنداڵ بە تەواوی لە کەلک وەرگرتن لەو شیعر و نووسینانە بێبەش دەبن .

**چوارەم :** بە هۆی تێکەڵاوی ژیانی ئابووری و کومەڵایەتی و پەیوەندی فەرهەنگی نەتەوە دراوسێکانەوە ، لە دونیای ئەمڕۆدا هیچ زمانێک نیە کە لە زمانی نەتەوەکانی تر و بە تایبەتی دراوسێکانی تەئسیری وەرنەگرتبێ و بۆ دەوڵەمەند بوونی خۆی لە ئەدەب و فەرهەنگی وان بێنیاز بووبێ زمانی کوردیش لەم رێبازەدا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ زمانی فارسی و عەرەبیدا هەیە و گۆڕینی رێنووس دەبێتە هۆی ئەوە بەتەواوی پەیوەندیمان لەگەڵ برایانی فارس و عەرەب ، کە خاوەنی ئەدەبیات و فەرهەنگێکی دەوڵەمەند و هەراون ، بپسێ و هەڵبڕانی ئەو پەیوەندییە لەکەلک وەرگرتن لە سەرچاوە هەرە بەنرخەکانیان بێبەشمان دەکا .

**پێنجەم :** لە ئەسڵدا هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەلف و بێی نەتەوە موسڵمانەکان بۆ سەر شێوە نووسینی لاتین پلانێکی ئیستیعماری و ئیمپیریالیستییە ، و مەبەستەکەشی دابڕینی نەتەوە موسڵمانەکان لە فەرهەنگ و زمانی یەکتر و لە فەرهەنگی رەسەنی ئیسلامی و قورئانی بووەکە لە ئاکامدا مەیدان بۆ نفووزی زیاتری ئیستیعمار ئاوەڵە دەکا و دەسەڵاتە گەورەکان زووتر بە ئامانجە شەیتانییەکانی خۆیان دەگەیەنێ ، کەوابێ ئەرکی هەموو ئازادیخوازانی موسڵمان و لە نێو ئەوانیشدا ئازادیخوازانی کوردە کە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم پلانە ئیستیعمارییە تێبکۆشن ولەو داوەنەکەون

**٢ ـ** ئەو وشانەی لە زمانی عەرەبی و فارسی و ...ە وە هاتوونە نێو زمانی کوردی دەتوانین بە ئیملای کوردی بیان نووسین . بەڵام ئەگەر نێوی کەسێک ، یا جێگایەک ئاڵۆز بێ دەتوانین هەر بە شێوەی زمانە ئەسڵییەکە بینووسین ، وەک : **نەسرین** ،

**سەعید ، قامووس ، مەزهەب ، سەلاح،بەغداد و ... بەلام ، صلاح الدین ، دایرة المعارف ، مستوفی الممالک و ...**

۳ ـ ئەگەر پیتی " و " یەکەم پیتی بڕگەیەک لە وشە بێ هەر بە یەک " و " دەینووسین وەک : **وشە ، ورچ ، ورد، وتی ، کاوڕ ، کاول** ، نووسینی ئەم وشانە بە"وو" لاساکردنەوەیەکی ناشیانە و فەرەنگی مەئابانە لە ( W )ی لاتینە کە لە کوردیدا پێویست ناکا و زۆریش دزێوە .

۴ ـ ئەگەر ئاخرین پیتی وشەیەک بزوێن بێ بۆ زیاد کردنی پاشگری " ە " لە ئاخری وشەدا دەبێ " **ی** " یەکیشی پێوە بلکێ یانی بە جێگای " ە " دەبێ " **یە** " لە وشەکە زیاد بکەین :

بۆ وێنە : دڵێین "**بەرد** " ـــ " ئەوە بەردە"

" **ئاو** " ـــ " ئەوە ئاوە "

بەلام " **دۆ** " ← " ئەوە دۆیە "

" **ترێ** " ← " ئەوە ترێیە "

" **دارا** " ← "**نادر برای دارایە** "

لێرەدا ئەگەر بزوێنەکە " ی " یا " ێ " بێ پاشگری " **یە** " بەجوێ دەنووسرێ . بۆ وێنە : " **ترێ یە** " و " **عەلی یە**"و "**سپی یە** " دروستن و "ترێیە" ، " عەلییە " و"سپییە " نادروستن .

ئەگەر بزوێنەکەش " **وو** " بێ ، هەر " ە " زیاد دەکرێ نەوەک " **یە** " ، وەک :

" **توو** " " **تووە** " .

۵ ـ ئەگەر ئاخرین پیتی وشەیەک بزوێن بێ بە جێگای زیاد کردنی پاشگری " **ێک** " و " **ێکی** " لە ئاخری وشەدا پاشگری "**یەک** " و " **یەکی** " زیاد دەکرێ .

بۆ وێنە :

" **بەرد** " " **بەردێک** " " **بەردێکی** "

" **کەو** " " **کەوێک** " " **کەوێکی** "

بەلام :

" **مراوی**" "**مراوی یەک** " "**مراوی یەکی** "

"**دەرزی** " "**دەرزی یەک** " "**دەرزەی یەکی** "

" **گرێ** " " **گرێ یەک** " " **گرێ یەکی** "

" **برا** " " **برا یەک** " " **برا یەکی** "

" **موو** " " **موویەک** " " **موو یەکی** "

۶ ـ پیتی " ت " لە ئاخری فیعلی سێهەم شەخسی موزاریعدا نەنووسرێ باشترە ، وەک : " دەڕوات" ، " دەکات" ، " دەبێت"، .... کە لە ئەسڵدا " دەڕواتن "، " دەکاتن " ، " دەبێتن "، ... بوون و "ن"ەکەیان قرتاوە و لە زۆربەی ناوچەکانیشدا بە بێ " ت " دەگوترێن و دەنووسرین ، وەک "**دەڕوا** " **دەکا** " ، " **دەبێ** " ، **و ...** کە زوربەی نووسەرە کوردەکانیش ئەوەیان زیاتر لەلا پەسندە . شاعیرە کۆنەکانیشمان ئەم کارەیان کردوە ، وەک نالی دەڵێ :

**تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**

**ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لەعەمداوا دەکا**

یا شێخ رەزا کە دەڵێ :

**کارێ کە غەم و دەردی فیراقت بە منی کرد**

**سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا**

۷ ـ لە شێوە ئاخاوتنی هێندێک ناوچەدا وشەی "**منداڵ** " ، " **قەند** "، " **سوێند** "،"**چەند**" و ... بەبێ " **د** " دەڵێن و دەنووسن ، وەک : " مناڵ " ، قەن " ، " سوێن " و " چەن" کە بۆ زمانی ئەدەبی کوردی بە "د " ەوە بنووسرێن دروستترە . لە هێندێک ناوچەش بە جێگای " **د** " دەنگێکی زۆر نزیک لە " **گ** " تەلەفوز دەکەن، کە لە نووسیندا نارەوایە .

٨ - " د "ی پاشگری " **دا** " له هێندێک لەهجەدا تەلەفوز ناکرێ. بەڵام له زمانی ئەدەبی کوردیدا بگوترێ و بنووسری باشتره واتا " له هاوینا "، " له سەقزا " و ..... نادروستن و " له"هاویندا " ،" له سەقزدا" و ... دروستن .

٩ - پێشگری " **ده** " له زۆر جێگا بە شێوەی " ئه " دەگوترێ که زۆربەی ئەدیب و نووسەرانی کورد به کارهێنانی " ده" یان پێ باشتره ، وەک "**دەڕۆم** "، " **دەڵێم** " " **دەکەم** " ، " **دەتگوت** " ، " **دەتخوارد** ، و ... له جێگای " ئەڕۆم " ئەڵێم" "ئەکەم" " ئەتوت " ، " ئەتخوارد"،...

١٠ - له زمانی کوردیدا پیتی " **هێ** " زور کەم دەکەوێتە ئاخری وشەکانەوه و یا هەر ناکەوێ، ئەو وشانەشکه پیتی "هێ" یان له ئاخر دایه و له فارسیدا "هێ " کەیان دەنووسرێ ، له کوردیدا به بێ " هێ" دەخوێندرێنەوه وەک : "سیاه"، " سپاه " ، " کاه " ، و ... مەگەر له شیعرێکیدا لەبەر وەزنی شیعر نووسین و خوێندنەوەی پیتی " هێ " له ئاخری وشه دا پێویست بێ ، ئەوه هەر به شکڵی "ه یاه " دەنووسرێ نەوەک به شکڵی "ه" که هێندێک نووسەر وای دەنووسن .

١١ - ( **چ** ) و ( **چی** ) وەک وشەیەکی جیاواز بەجوێ له وشەکانی دوای خۆیان دەنووسرێن و تەنیا به زەمیرەکانەوه دەلکێن وەک : چ بکەین ؟ یا چی بکەین ؟،چمان هەیه؟ چت کرد ؟ ... چیبکەین و چبکەین نادروستن

١٢ - چونکوو له رێنووسی کوردیدا به پێچەوانەی فارسی و عەرەبی بزوێنەکان هەر به پیتەکانی ئەلف و بێ دەنووسرێن هەر وشەیەک دەبێ به چەند برگەی جوێ له یەکتر . ئەگەر ئەم چەند برگەیه نزیک له یەکتر نەنووسرێن و لەگەڵ وشەکانیَ ئەم لا و ئەولا نێوانیان نەبێ خوێندنەوەیان هاسان نابێ ، وەک ئەم دێڕە :

" ئەگەررێنو وسیکو رد یره چاو نەکر ێخو ێندنه وەونوو سینی کور دی کا رێکی د ژواره . "

که دەبێ بەم جۆره بنووسرێ :

" ئەگەر رێنووسی کوردی رەچاو نەکرێ خوێندنەوه و نووسینی کوردی کارێکی دژواره . "

ئەڵبەت بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەرو نیشاندانی مەبەستەکەمان وشەکانی ئەم رستەیەمان زیاتر له رادەی ئاسایی و پێویست دوور له یەک نووسیوه .

١٣ - هەر وەک له خاڵی پێشوودا باسمان کرد به هۆی نووسینی بزوێن به پیتەکانی ئەلف و بێ هەر وشەیەک دەبێ بەچەند برگەی جۆێ له یەکتر وەک :"**خوێندنەوه**" که بریتیه له پێنج برگەی "**خو**" ، "**ێند**" ، " **نه** "، " **و** " ، ڕ " **ه** " کەوابێ بۆ ئەوەی ژمارەی برگەکانمان به دەستی خۆمان زیاد نەکردبێ، جگه لەو جێگایانەی له خاڵەکانی ۴ و ۱۱ دا باسمان کردن ، هەتا دەگونجێ برگەکانی هەر وشەیەک چ ساده بێ و چ لێکدراو ( مرکب ) دەبێ بەسەر یەکەوه بنووسین ، وەک :

" **هەڵگرتن** "، " **لێزان** " ، " **لێکدان** " ، " **تێکدان** "، " **تێکۆشان** "، " **تێبینی** " ، " **گوێ لێگرتن** " ، " **باشتر**"، " **له دواییدا**" ، " **رێنووس** " ، " **گوڵدانمان هەیه**" و ... له جێگای " هەڵ گرتن "، " لێ زان " ، " لێک دان "، " تێک دان " ، "تێ کۆشان " ، " تێ بی نی " ، " گوێ لێ گرتن "،"باش تر"، " له دوایی دا "، " رێنووس" ، " گوڵ - دان مان هەیه " ، و ...

١۴ - ئەگەر پێشگری " **هەڵ** " به وشەیەکەوه بنووسێ که یەکەم پیتەکەی " ل " بێ ئەو پێشگره به وشەکەوه

ل ٨۶ ←

## مامۆستا مەلا رەشیدی بورهانی

**الحمدلله الذی امرنا بالتوحید.والصلوه والسلام علی سیدنا محمدالمصطفی و آله و اصحابه اهل التوحید.و نشهد ان لا اله الا الله و ان محمدا عبده و رسوله صلی‌الله علیه و آله و سلم .**

**رب اشرح لی صدری و یسرلی امری واحلل عقده من لسانی یفقهوا قولی .**

" خودایە قەلبم بۆ رەحمەت و مەعانی ئایاتی‌خۆت ئاوەڵا بکەیەوە و گرێی زمانم بکەیەوە تا ئۆمەتی محەممەد (د.خ ) لێم حاڵی بێ کە تەفسیری ئایاتی قورئان دەکەم ."

ئەو سوورەتە پیرۆزە لە قورئانی مەجیددا کە هێندێک لە ئایەتەکانی بە تەوفیقی خودا بۆ ئێوەی خۆشەویست مانا لێدەدەمەوە سوورەتی ( آل عمران )ە .

لە دوای بسم الله الرحمن الرحیم و (حروف مقطعه)ی الم ، ئایەتی دووهەمی ئەم سوورەتە کەلیمەی تەوحیدە. **الله لا اله الا هوالحی- القیوم** .( ۲ ) یانی خودا ئەو خودایەیە کە هیچ مەعبوودی بەحەق نیە ئیللا ئەو کە هەمیشە زیندووە. قەت زەواڵی نابێ . هەر بووە و هەر دەبێ. ئەزەلی یە ، ئەبەدی یە ، وەکەس ناچێ و کەسی وێ ناچێ. هەر وەک لە سوورەتی ( اخلاص )دا فەرموویە " **ولم یکن له کفوا احد** ". جا بۆیە قەییومە ( واجب الوجود )ێکە کە هیچ گۆڕانی بەسەردا نایە. قائیم بە زاتی خۆیەتی. تەدبیر و مانەوەی کەون و مەکان، وجوودی هەمو و مومکیناتی عالەم هەر بەوی یە .

بە ڕاستی کەلیمەی تەوحید ،ئەگەر بەو جۆرە کە خودا لە ئێمەی دەوێ لە قووڵایی دڵەوە لێی حاڵی بین و عەمەلی پێ بکەین دەبێتە هۆی تەوحیدی کەلیمە ،یانی بەڕاستی خودا بناسین و بە تاکی بزانین . **قل هوالله احد**. ئەی محمدالمصطفی بە خەڵک بڵێ خودا یەکە ،بە فەرمانی وی عەمەل بکەن ؛ بە ڕێگای ڕاستی ویدا بڕۆین. **اهدنا الصراط المستقیم** ، وەحدەتی کەلیمەی بە خۆی لە نێوماندا پەیدا دەبێ. ئەنجا بە چاکی دەتوانین بە خۆمان بڵێین(ئوممەتی واحیدە) ، عەبدی خودای واحید ، خاوەنی قیبلەی واحیدە ، خاوەنی قورئانی واحید ، خاوەنی وەحدەتی کەلیمە ، خاوەنی مەقسەدی واحیدە کە ئیعلای کەلیمەی تەوحیدە . لە ئایەتی سێهەمی ئەو سوورەتەدا باسی ئەوە دەکا کە خودا تەعالا قورئانی بۆ پێغەمبەر ناردووە ، بە حەقیقەت مەتالیبی قورئان هەقن، بێ شک و شوبهەن ، شک لە قەلبی کافر و بێ ئیمانان‌دا هەیە، دە قورئاندا

نیە ( **لا ریب فیە** ) .

قورئان تەسدیقی هەموو پێغەمبەران(دخ) دەکا . ناردنی تەوڕات و ئینجیل لە پێشدا و ناردنی قورئان لە دوایيدا ، هیدایەتە بۆ خەڵک ، خۆ دیارە قورئان هیدایەتە بۆ ئەو پەرهیزگارە کە لە خودا دەترسێ . وەدوای قورئان دەکەوێ . وەک لە سوورەی ( **البقرە )دا** فەرموویە " **هدی ـ للمتقین** " لە چەند ئایەتی یەکەمی سوورەی ( **آل عمران)دا** ئەو مەبەستانە هەن .

١ ـ عەزابی کافری بێ ئیمان شەدیدە .

٢ ـ خودا بەهێز و خاوەن قودرەتە و تۆڵە لەو کافرانە دەکاتەوە .

٣ ـ بێ گومان هیچ شتێک لە ئەرز و ئاسماندا لە خودا بزر نابێ، جا چۆن گوناە دەکەی؟ چۆن لەگەڵ برای موسڵمان ئیختیلاف دەکەی؟ چۆن وەحدەتی کەلیمە ناکەی بە هەدەف و مەقسوود؟ چۆن بو یەکگرتنی عالەمی ئیسلام تێ ناکۆشی؟

٤ ـ خودا ئەو خودایەیە کە ئێوەی لە نێو منداڵدانا تەسویر و خەلق کردووە ، بەو جۆرەکە بۆ خۆی ئیرادەی کردووە . مەعبوودی بەهەق هەر ئەوە . عەزیز و حەکیم هەر ئەوە .

بەڵێ سووڕەتی ئالی عومران بەتەنێ تا دەگاتە ئایەتی سەد و یەکەم، پتر لە هەزار مەبەستی جۆر بە جۆری تێدایە. هەر مەتڵەبێکی قورئانی مەجید ، کتێبێکە کە زەمین و ئاسمان و بەحر و بەڕ بەڵکە دنیا و ئاخیرەت گۆشەیەکی بچووکی تەفسیری ئەم کتێبەیە ، " **فیها کتب قیمە** " .

ئەمجار بە ... ی خودا ، دەست بە مەبەستی خا... ئایەتی سەد و یەکەم دەکەین . قال اللە تعالی : **و من یعتصم باللە فقد هدی الی صراط مستقیم** " یانی هەر کەسێک پەنا بۆ خودا ببا ، دەست بە دینی خودا بگرێ، پەناگای هەر خودا بێ ، بەتەحقیق ئەو کەسە هیدایەت کراوە بۆ ڕێگای ڕاست. گەیشتۆتە سەر جادە و ڕێگای بەرین و ڕاست کە دینی ئیسلامە .بەم ئایەتە وا دەردەکەوێ کە لە هەموو کارێکدا ، لە هەموو دەورانی چەند ڕۆژەی ژیانی دنیادا کە نیسبەت بە ئاخیرەت چێژێکی زۆر کەمە "**متاع قلیل**" ، تەنیا پەنا بۆ خودا بردن ، هیدایەت بۆ ئینسان بەدی دێنێ . ئینسان هەر ئەوەندەی بەسە کە خودا بە پشت و پەنای خۆی بزانێ، تەوەککولی بە خودا بێ ، لە هەموو ئەحواڵ و ئەوزاعدا خودا بە حازر و نازر بزانێ ، " **ومن یتوکل علی اللە فهو حسبە** ، کوفر،نیفاق ، زوڵم ، گومڕاهی، دزی ، پیاو خراپی ، ڕێگری ، دووبەرەکی نانەوە ، تەفرەقە، وەسوەسە ، خەیاڵاتی باتڵ ، ئامال و ئارەزووی بێهودە ، تەکەببور ، تەمەع ، تەجاوز ، فسق ، دەسائیس ، ئەفکاری شەیتانی ، ریا، حیلە گەری ، بەکورتی هەرچی باتیلە لە بەرامبەر ئیعتیسام بە خودا ، یانی لەو کاتەدا کە پەنات بۆ خودا برد ، لەبەین دەچێ ، جا چ لەمە خۆشترە کە بە قەلبی پڕ لە ( معرفە اللە ) ، دوور لە هەموو خیلافی شەرعێک، دوور لە هەموو باتیلێک عیبادەت بۆ حەق تەعالا بکەی و بەپێی فەرمانی خودا خزمەت بە بەندەگانی ساڵح بکەی و هیدایەتیان بدەی." بۆ چاکان برا بە ، بۆ خراپان چرا بە ." تا لە سایەی کەلیمەی تەوحید ، لەبن پەرچەمی **لا الە الا اللە محمد رسول اللە ،** تەوحیدی کەلیمە وەحدەتی کەلیمە ، یەکێتی و برایەتی ، لە ناو ئۆمەتی محەممەد بەدی بێ .

ئایەتی سەد و دووی ( آل عمران)دەفەرموێ " **یا ایها الذین آمنوا اتقوا اللە حق تقاتە ولا تموتن الا و انتم مسلمون( ١٠٢ )** بانگەواز ( ندا آت )ی قورئان چەند جۆرە ، بانگ کردنی پێغەمبەرێک بە ناو وەک :

**یا آدم ، یا نوح، یا ذکریا ، یا موسی، یا یحیی** بانگکردنی حەزرەتی ( محمد المصطفی) بە وەسفی ( نبوت ): **( یا ایها النبی سلام الله علیهم اجمعین)**. بانگ کردنی زەمین وەک: **( یا ارض ابلعی )**. بانگکردنی ئاسمان وەک **( باسماء اقلعی )** . بانگ کردنی ئاگر وەک: **( یا نار کونی بردا و سلاما )**.بانگکردنی کافران : **قل یا ایها الکافرون لا اعبد ما تعبدون )** . بانگکردنی هەموو ئادەمیزادێک :**(یا ایها الناس اتقوا ربکم ان زلزله الساعه شی عظیم)** .چەند جۆرە بانگکردنی دیکەش لە قورئانی مەجید دا هەیە . ئەو مەبەستەی ئێمە لێرەدا باسی دەکەین. بانگ کردنی هەموو ئیماندارێکە **( یا ایها الذین آمنوا )** لە قورئاندا زۆرە . لە زەمانی نزوولی قورئانەوە تا دنیا ماوە، لە هەموو عەسر و زەمانێکدا ، ئەو بانگەوازە هەر دەنگی دێ . سەدای ئەو وەحیە کە خوداوەندی خالیق بانگی عەبدی ئیماندار دەکا ، بە حەزرەتی (رسول الله)دا رایگەیاندووە، زەمین و زەمان دەنگی داوەتەوە. کورتەی مانای ئایەتەکە: ئەی ئەو کەسانەی ئیماندارن، لە خودا بترسن بە ترسانێکی هەق و واجیب و سابیت . مەمرن مەگەر ئەودەمەی کە ئێوە موسڵمانن یانی وامەکەن بە کافری بمرن. ئیسلام بن ، ئیمان بێنن، خودا بناسن.

ئەو ئایەتە پیرۆزە چەند دەرسێکی لێ وەردەگیرێ :

۱ ـ ئیمان گەورەترین نیعمەتی خودایە دە قەلبی ئینساندا . خودا لە ئیماندار رازییە ، خۆشی دەوێ ، بانگی دەکا ، رێگای بۆ دادەنێ ، ئیمان باوەڕ کردنە بە خودا و رەسوول ، بە مەلائیکە بە **(کتب منزله )**، بە رۆژی قیامەت ، بە قەدەر ، بە خێر و شەڕ و بە جەمیعی **( ما جاء من عندالله )** کە تەوحید و نبووەت و مەعاد، هەموان دەگرێتەوە .

۲ ـ پەرهیزگاری زۆر پەسندە ، فەرمانی خودایە بۆ ئیماندار .

۳ ـ دەبێ ئیماندار بەڕاستی نەک بە فێڵ و تەڵەکە ، لە خودا بترسێ و بە فەرمانی خودا عەمەل بکا . هەر چی فەرموویە بیکە ، دەبێ بیکەی، هەرچی فەرموویە مەیکە ، نابێ بیکەی .

۴ ـ ئەمر بە مەعرووف بۆ خۆت و خەلق و نەهی لە مونکەر بۆ خۆت و خەلق، بکەی بە وەزیفە .

۵ ـ دەبێ سەعی بکەی بە کافری نەمری خۆت بەدبەختی دنیا و قیامەت نەکەی،ئیمان بێنن، ئیسلام بن ، لەسەر دینی ئیسلام بە موسڵمانی وەفات بکەن.

۶ ـ لە ئیماندا ، ئەمن و هێمنایەتی و سوکنایی دڵ و راوەستانی لەسەر هەق و هەقیقەت بەدی دەکرێ . لە ئیسلامدا ، سلم ، سەلامەتی ، رۆح و گیان ، سوڵح و سەفا، محەببەت ، ئوخووەت ، وەحدەت ، هەموو سیفاتی حەمیدە ، رازی بوونی خوداوەندی موتەعال .

۷ ـ تەقواش دەرەجەی هەرە ئەعلای ئیماندارە کە دەبێتە هۆی بەڕێز بوون لە لای حەق تەعالا **(ان اکرمکم عندالله اتقیکم )**

۸ ـ ئەگەر خۆت هەست بە تەنبەڵی بکەی رێگای ئیسلام ، نەگری، لە خەوی غەفلەتدا

دەبی و ئاگات لێ نابێ عومرت خلاس دەبێ و بە بەدبەختی دەمری. هەر کە مردی دەکەویە ناو جەهەننەم کە بە قەهری خودا ئامادەیە بۆ گوناهکاران.

خودایە بمانپارێزی لە ئاگری جەهەننەم لە عەزابی خۆت، خودایە رێگای قورئان لە قەلبی هەموو ئینسانێکدا ئاشکرا و سابیت بکەی (آمین یا اللە)

لە ئایەتی سەد و سێهەمدا دەفەرموێ (**واعتصموا بحبل اللە جمیعا و لاتفرقوا**). تەرجەمەی موقەییەدی ئەم بەشەی ئایەتەکە ئاوایە:

" خۆتان بگرن بە رێسمانی خودا، پێکەوە و تەفرەقە مەکەن" یانی هەمووتان ئەی گەلی ئیمانداران وێکڕا بێ تەفرەقە و جیا بوونەوە بە دەستە جەمعی، پەیمانی خودا بگرن، دینی خودا بگرن، کتێبی خودا بگرن، بە چاکی عەمەلی پێ بکەن. لێرەدا ئەم دەرسانە وەردەگرین:

١ ـ **اعتصموا**: ئەمرە بە هەموو ئیماندارێک کە لە هەموو عەسر و زەمانێکدا دەبێ وێکرا پەیمانی خودا بگرن. ئەگەر کەسێک بەتەنیا لە گۆشەیەک دانیشێ پەیمانی خودا بگرێ یا جەماعەتێک لە مزگەوتێدا پەیمانی خودا بگرن، کارێکی باشە بەڵام نەبوو بە ئیعتیسام بە تێکڕایی، جەمیعەن نەبوو. دەجا ئۆمەتی موسڵمان کارێک بکا جەمیعەن پەیمانی (**رب العالمین**) بگرن.

٢ ـ لەباتی (**دین اللە، عهد اللە، کتاب اللە**) مەسەلەن (**حبل اللە**) لەم بەشەی ئایەتەکە باس کراوە، چونکە تەماشا بکە ئەگەر کەسێک دە بیر یا بەحر بکەوێ یا لە شاخ هەڵدێرێ، گوریسێکی بۆ داوێن تا دەستی پێ بگرێ و نەجات بدرێ. جا چونکە ئەو دونیایە گێژاوە، بەحرە، دەریە، ئامال و ئارەزوو، ئەعمالی شەیتانی، ئەفکاری پووچ، فرو فێڵ، فیز لێدان، تیز پێ کردن، دەسائیسی نەفسی ئەممارە و هەزاران فەجایعی دیکە، وەک هەژدیها زاری داپچڕیوە، بە تایبەتی لە ئینسانی بێ ئیمان، بۆیە خودای موتەعال بە رەحم و کەرەمی خۆی، دین و قورئان و عەهد و پەیمانی خۆی وەک گوریسێک بۆ هاوێتوویە خوار، بۆی هاویتوویە ناو ئەو گێژاوە تا خۆت نەجات بدەی. بە نووری ئیمان بە پەیمانی خودا لە هەموو بەلایەک نەجات ئەبێ، ئەو پەیمانە بەرنەدەی تا دەچیە ناو بەهەشت (**اللهم ارزقنا الجنه**)

٣ ـ **اعتصموا**: ئەمری خودایە دەبێ بە تێکڕایی عەمەلی پێ بکەین چونکە ئیتاعەی ئەمری خودا واجبە. (**اطیعوا اللە و رسولە ولاتفرقوا**)، نەهی یە لە تەفرەقە، نابێ بە هیچ جۆرێک لە ئیماندا، لە تەقوادا، لە ئیعتیسام بە (**حبل اللە**)دا، لە شەریعەتی (**رسول اللە**)دا تەفرەقە بکەین، نابێ لێک جودا بین، نابێ هەر بەلایەکدا وەدوای هەوا و هەوەس بکەوین، دەبێ وەحدەتی کەلیمە وەحدەتی هەدەف، یانی ئیعلای کەلیمەی تەوحید، وەحدەتی قووەت لە ناو ئیسلامدا هەبێ.

بەشی دیکەی ئەم ئایەتە ئاوایە:

(**واذکروا نعمه اللە علیکم اذ کنتم اعداء فالف بین قلوبکم فاصبحتم بنعمه اخوانا**)

یانی یادی نیعمەتەکانی خودا بکەن لەسەر ئێوەیە کە زەمانێک هەمووتان دوژمن بوون پاشان خودا قەلبی ئێوەی لێک نزیک کردەوە. بە کەرەم و نیعمەتی خودا هەموو بوونە برا. هەر چەندە لە مەرحەلەی هەوەڵدا ئەم خیتابە لەگەڵ ئەسحابی کیرامە (رض) بەڵام هەر وەک لە پێشدا باسی کرا، سەدای وەحیی خودا لە هەموو عەسر و زەمانێکدا هەر دێ، بۆ هەموو تەبەقاتی بەشەر دەبێ چونکە لە ناو جەماعەتی بەشەردا هەموو زەمانێک

عەداوەت و پێک هەڵپڕژان هەیە ، بەڵام کەسێک خودا نیعمەتی بداتێ و ڕەحمی پێ بکا ، پاشی عەداوەتەکە پێکیان دێنێتەوە، دەبنە برا ، دەبنە مەشموولی ( **فالف بین قلوبکم فاصبحتم بنعمه اخوانا** ).

**دەرسەکانی ئەم بەشە :**

١ ـ دەبێ هەمیشە نیعمەتەکانی خودات لەبیر بێ .

٢ ـ سوڵح و تەئلیفی قلووب و برایەتی پاش عەداوەت نیعمەتێکی گەورەیە ، بە فەرمانی خودا دەبێ لەبیری نەکەی .

٣ ـ ئوخووەت و برایەتی و تەئلیفی قلووب، خوداوەندی موتەعال کردوویە بە میسال بۆ نیعمەتی گرینگ .

٤ ـ هەر موسڵمانێک ، هەر قەبیلەیەک هەر جیرانێک کە لەگەڵ موسڵمانی دیکە ، قەبیلەی دیکە، جیرانی دیکە ، عەداوەتیان لێ پەیدا بووە ، ئەگەر بە پێی ئیمان و قورئان و شەریعەتی ( رسول الله ) پێک بێنەوە ، مەشموولی( **فالف بین قلوبکم** ) دەبن. مەشموولی ( **فاصبحتم بنعمه اخوانا** ) دەبن و خودا لێیان رازی دەبێ بەڵام دەبێ لە کاتی هەر جۆرە پەیمان و پێک هاتن و برایەتی‌یەکدا خودا بە حازر و نازر بزانن و لە چوار چێوەی دەرنەچن.

بەشێکی تری ئایەتەکە ئەوەیە کە دەفەرمێ : ( **و کنتم علی شفا حفره من النار فانقذکم منها** ). یانی ئێوە لەسەر لێوی قووڵکەی ئاگری جەهەننەم بوون خودا لەو ئاگرەی نەجات دان. لەم بەشەی ئایەتەکە فەهم دەکرێ کە کوفر قووڵکەی جەهەننەمە .کافر لەسەر لێوی جەهەننەمە عەداوەت لە ناو موسڵمانان‌دا زۆر خراپە زەعف ، تەفرەقە ، بەدبەختی و شکستی ئیسلام لە عەداوەت پەیدا دەبێ. ئیمان و عەمەل بە قورئان و شەرعی( ڕەسول الله ) سەبەبی تەئلیفی قلووب و مەحەببەت و سەفایە بە ئیمان ، بە تەقوا ، بە تەئلیفی قلووب ،بە وەحدەتی کەلیمەی موسلیمین ، ئۆمەتی ئیسلام لە ئاگری دنیا و قیامەت نەجاتیان دەبێ .

خاتیمەی ئایەتەکە دەفەرمێ: ( **کذلک یبین الله لکم آیاته لعلکم تهتدون**(١٣٠) ) یانی هەر ئاوا خودا بۆ ئێوە ئایات و ئەحکام و فەرمانی خۆی بەیان دەکا بەڵکە ئێوە بێنە سەر ڕێگای ڕاست و هیدایەتوو وەگیر بکەوێ . لەسەر هیدایەتی خۆتان سابیت بن . خۆ لەم خاتیمەی ئایەتەکەوە مەعلوومە کە خوداوەندی مەزن زۆر ئایاتی شەرح داوە ، زۆری بەیان فەرمووە ، زۆری لە قورئاندا نازڵ کردووە، هەروا بۆ پێغەمبەرانی سەلەف (سلام الله علیهم ) بەیانی ئایاتی فەرمووە ، هەمووی بۆ ئەوەیە کە بەشەر ڕێگای هیدایەت بدۆزێتەوە و لە شەڕی شەیتان و نەفسی ئەممارە مەحفووز بێ.

**"و آخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمین"**

" صلی الله علی سیدنا محمد و آله اجمعین"

## " سەرچاوەکان "


١ ـ قورئانی مەجید

٢ ـ کلمات قرآن .تەئلیفی حسنین محمد محلوف .

٣ ـ تفسیر اسئله القرآن المجید تەئلیفی محمد بن ابی‌بکربن عبدالقادر رازی .

( لە عولەمای قەڕنی حەوتەمی هیجری )

٤ ـ نزهه القلوب فی تفسیر غریب القرآن تەئلیفی ئیمام ئەبووبەکری سەجستانی

( لە عولەمای قەڕنی چوارەم )

٥ ـ تفسیر قرآن. اسماعیل ابن کثیر

٦ ـ تفسیر روح البیان. تەئلیفی شێخ ـ ئیسماعیلی حەققی

٧ ـ تفسیر مجمع البیان.تەئلیفی شیخ ـ طبرسی

# یادی مامۆستا سەججادی

دوستێکی زۆر خۆشەویستم رووی لێناوم .چونکە چەند ساڵ لە بەغدایە دەگەڵ "علاءالدین" ژیاوم .زۆر لە نیزیکەوە دیومە و بە هەموو باران ناسیومە بە یادی کۆچی یەکجاری کە ئەم بەینانە رووی داوە کورتە و تارێک بنووسم .

من گەرەکمە نووسینەکەم تایبەتی بە تاکێک نەبێ . دەگەڵ رێز لە نووسەر گرتن سەرکۆنەی ئەوانەش بکەم کە بە دوو ربان دەپێون و هەر تاوێ جۆرێ داخێون .

جارێک لە گۆواری "هەولێر" کە لە هەولێرێ دەر دەچوو ، خەبەرۆکێکم نووسیبوو کەچی لەبەر بەختی کەچم دەچاپداندا تێک درابوو ،سەر و قوونی لێک درابوو، کەس تام و چێژەی لێ نەکرد، کورتە باسەکەش ئەمە بوو:

" رۆژێک سەیری دووکانێکی بەغدام دەکرد .چەقەڵێکی مۆمیلیی کراوی لێ داندرابوو، لەژێر قاچیەوە نووسرابوو (بیست و پێنج دیناری تەواو)...من سەری زمانی خۆم گەست ، هات بە دڵما،هەیاران! ئەم مام چەقەڵە موحتەرەمە ئاخۆدەبێ بە زیندی سەر شاعیر ،نووسەر، هونەرمەندێکی کورد بووبێ . لە ژیانیدا لە برسان و لە ترسان ئۆقرەی نەبووبێ و ئێستاکێ لاشەی مردگی بەم دەرد و مەخسەرە چووبێ؟ کێ ئەزانێ؟؟ هەزار دانە بە زینوویی فلسێ ناژین کەچی یەکێک بە مردوویی بایی بیست و پێنج دینارە!! بە خوای سەیرە!! لە درێژایی مێژووی پڕ نەگبەتی کورددا ، هەر شاعیر ،هەر هونەرمەندێک لە ناو کورددا هەڵکەوتبێ و هونەرەکەی بە زمانەکەی خۆی رانابێ و شیعری بە کوردی دانابێ، هیچ کەس ئاوڕی وێ نەداوە، بە سووک تەماشای کراوە، بوویتە مەسەل " هەر کەس پینەی پێوە دیار بێ ، جلکی شڕ و بەتیتۆڵ بێ ، کەوشی چەک و بە بزمار و لار و خوار بێ.دەڵێن لاچۆ تەرحت هەر لە شاعیر دەکا!!..کەس تەنانەت تووشی بە کڵاوی ناپێوێ ، کەس پێی ناڵێ کەرت بە چەند "

هەر بۆیەشە بەشێکی زۆر لە نووسەرانی بەچکە کورد ، لەبەر ناچاری و هەژاری وەزوان نامۆیان نووساوە و خۆیان و منال و کاڵیان لە مەرگی بێ کوللێرەیی لە پەنایەک حەشار داوە .نامەوێ مەلای جزیری،خانی،نالی،حاجی، مەولەوی و زۆریتر لەو کەسانەی ئێستا مایەی شانازی کوردەکانی کوردستان و کوردناسانن ، بۆ نموونە بهێنمەوە، لازم ناکا مێژووی کۆنتان بۆ بخوێنمەوە، ئەمەوێ هەر بەسەرچڵی و مەویز

# یادی مامۆستا سەججادی

نموونەی کەویژێک ئەوانە وەبیر بێنمەوە کە هاوچاخی خۆمان بوون و دەمانناسین.

مەلا مارفی کۆکەیی ئەگەر بێژم لە برسا مرد رەنگە باوەڕم پێ نەکەن چونکە ئەودەم نانی وشک زۆر هەرزان بوو....

مەلا ئەمجەد ئەو هونەرمەندە بێوێنەی کە نازناوی شیعری (کاک) بوو، ئاغای لێ ببوە رمووزن و لە چەند جێ دێ بەدەریان کرد.

قانیع تا مرد نان و دۆی خۆی رۆژێک لە پەنایەک نەدیت.

حاجی تەوفیقی پیرەمێرد کە حاڵی ماڵیشی خۆش بوو، هەر چونکە کمونیست نەبوو، کەس رۆژنامەکەی نەدەکڕی، دەیانگوت دەستندە خۆری ئینگلیسانە.

فایق بێکەس کە چریکەی گوێی دوژمنانی کەڕ دەکرد، دوو لێفەی لە ماڵدا نەبوو کە خۆی و منداڵەکانی پێ داپۆشێ بە قەرزداری جوولەکەی ئارەق بە قەرزدەر مرد.

گۆران ئەو ئەستێرە گەشەی ئاسمانی ئەدەبیاتی کورد، بۆ دابین بوونی بژیوی، دەگاتە یافای فلەستین وتار بێژی رادیۆی "شەرقی ئەدنا" بێ ...

جگەر خوون پەنجا ساڵ پتر بۆ شیعر و چیرۆکی کوردی چەوسایەوە. لە جیاتی نان خوێنی جگەری خۆی دەخوارد. چەندە لە کوردستان ژیا و من دەمناسی گەسک لێدەری کولانان لەو تێرتر بوون، کەس ئێرەیی پێ نەدەبرد. ئەوانە لە ژیان ئاوا بوون، لەپاش مردنیان چاوا بوون؟

ئەگەر تاک و تەرایەکیان وەک مەلا مارف و قانیع ومەلا ئەمجەد وچەند هەناسە ساردی دیکەش ،تەرم نێژان لە گۆڕستان بە چەند خودا عافووی بکا گوتن بڵاوەیان لێ کردن و چوون هەر چوون و ناویان دەگەڵ لاشیان ون بوون..؟! لەو شارو شوێنەوارانەی لەو پارە دارانەی زۆر بوو کە خۆیان بە کوردپەروەر و رۆشنبیری دۆستی نووسەران دەزانی. لەپاش ساڵێ سڵامالێ وەخۆ کەوتن، بۆ یادی فایق بێکەس و پیرەمێردی گردی یارە و مەرگی گۆران میوانیونان و خوان درا .رووپەڕ بە جاڕێ وەرگەڕا ،چۆن دەبێ لەبیرمان بچن ؟ ئەشێ ناشتنی لاشەیان، ئەم هەموو کردە باشەیان لە لایەن ئێمەی رۆشنبیر کە لە کوردی پەرستیدا ئاوی شەوێ شلوێ ناکەین وەبیر حەشاماتی مەردم بخرێتەوە ، دەتگوت مەولوودنامە دەکەن ، بەر دەرک و بان و بێڵایی ئاو رشێن کەن ، بەڕان راخەن ، سەنیر و پاڵە پشت داخەن ، شتی بۆنخۆش بسووتێنن ، چرا و مۆمان داگیرسێنن ، دنیا بکەنە چراخان ، چەند کەس هەر گولاو بپژێنن،کابانی دەستاو خۆش بانگ کەن ، قۆڵی بە بازن هەڵماڵن تەشک و داوێنی لێ هەڵکەن ، پلاو ملاوی زۆر چێ کەن با چەور بێ ،کشمیش و خورماشی تێکەن خۆرشت وترشک زۆر خۆش بێ، با هەموو چلەیەک بۆش بێ، وێڕای هاوسای کۆک وپۆشتە و دەرو جیران ،لەو رووتانەش بگێڕنەوە کە دەم دە شیعران وەردەدەن و زۆر تامەزرۆن . با بە خێری گیانی مردووەکە تێر بخۆن . هەموو رۆژێ هەڵناکەوێ کفتەی مفتە وا بەلاش و بە لێشاو بێ .... سا ئەوانیش لەسەریانە بە وتاری بایەخدار و بە شیعری تەڕ و ئاوداریان کۆڕەکە بڕازێننەوە .

لەپاش مڕ بوون لە خواردن و لەپاش پڕ بوون لە شەکراوان

و مەکراوان ، هەر دەم یەکێ
لەسەر بەرزەک قوت دەبتەوە
و بەو پەڕی گفت و لفتی
خۆش دەس پێ دەکا :

" خوشک و برایانی بەڕێز
تکا دەکەم هەسنە سەر پێ ،
دەقیقەیەک قڕ و قپ ، فەزای
بێ دەنگە ، رەنگە هەر لەم
دەقیقەدا گیانی نازداری
کۆچ کردوو لە بەهەشتەوە
بفڕێتە سەر ئەم کۆڕە و
ببیسێ چۆنی باس دەکەین!!
دایکم دەیگوت پلکە بەسێ لە
خاتوامانی مامانی دەگێڕاوە
کە ئەم زاتە مبارەکە هەر
ئەو ساتەی سەری لە هێلکە
جوولاوە ،سەهەندە و بلیمەتێک
بوو هەموومان واقمان
وڕمابوو . مەمک مژینی
مەوزوون بوو، گریانەکەی لە
رەوتی شیعری ئازاد بوو.
بیلامانێ ، بیلاتەژبی ، با
پەرژینەکە بە گوڵ بێ
ئاوپژێنی بە قافیە و مافیە
دەردەچوو، لە بێشکەدا بە
گرۆگاڵی منداڵی بەیتی
وای دەهۆندەوەنوون لە چاوی
ئێمەدا بێ لەودا نەبوو. ئەی
هەزار رەحمەت لە گۆڕی
ئەلفاتیحا ..." .

یەکێکی تر قەسیدێکی
دوور و درێژی داناوە مردوو
دەلاوێنێتەوە . شیعر و وتار
وەکوو قەتاری وشتران
بە زنجیرە دێن و دەچن .
لەسەریەک کەڵەکە دەبن .های
لەو کوڕەی چالاکانە فریا
کەوێ و ئەو یادنامەیە چاپ
بکا . لە سایەی مەرگی خوا
بەخشیو ئەوەندە پووڵ پەیدا
دەکا کە مردووەکە خەونیشی
پێوە نەدەدیت .

وەک بۆیان گێڕاومەتەوە
کەتەرمی پاکی جگەر خوون
لە سوێدەوە هاتۆتەوە بۆ
گۆڕستانی قامیشلی" لە لایەن
کوردەکانەوە پێشوازی‌یەکی
وای لێ‌کراوە کە کەمتر وێنەی
دیتراوە . بە سەتان بگرە
هەزاران ترومبیلی هەواداران
لەو دەشتەدا وەکوو مەڕی
حاجی تاغی سەریان نەپاشڵی یەک
ناوە ،سەدهەزاران لە ناشتنیدا
بەشدار بوون . ئەی خودا
خێریان بنووسێ !

خوشک و برا کوردەکانی
هاو زەمانی هاو زمانم .
دەزانم ئێوەش دەزانن ئەم
قسانە ئەفسانە نین سەربەخۆ
هەڵبەستبێ،ئێوەش ئەوانەتان
دیوە و بە دڵتاندا تێ پەڕیوە
بەڵام وەک من دەخۆتان
رانەدیوە دەری بڕن . وەرن
هەر لە خۆتان پرسن تۆ خوا
مەلا ئەوە ئاردە؟! ...

بە بڕوای من ئەو خۆ لە
زیندوو بواردنە و بۆ مردنی
خەم خواردنە ،ئاکارێکی نزم
و نانەجیبانەیە ،ئێمەی کورد
خاکەسەر و بێ سەر و بەر ،ژێر
چەپۆکەی داگیرکەزان،لە ناو
خۆدا و لە هەندەران.
خێرە و مەندێک دەس ناکەوێ
دانی خێرمان پێدا بێنێ ،
دڕوویەک لە لەشمان دەربێنێ
هەزار و ئەوەندە ساڵە لەو
چاڵەدا قەتیس ماوین و
بێ ناوین . نەیارانمان
ویستوویانە زمانە زگماکەکەمان
لێ بەربەست کەن. لە سایەی
بێ زمانی‌یەوە بەیەکجاری
مافی رەوای نەتەوییمان پێ پەست
کەن .ئەگەر من و تۆش نەزانین
ئاغاکانمان باش دەزانن هەر
زمانە قەباڵەی بوونی گەلانە ،
هەر گەلێ زوانی نەمێنێ قەت
نایکرێ سەر هەڵێنێ و خۆ
بنوێنێ و مافی رەوای خودا داوی
وەدەست بێنێ .

هەر گەلێک یان هەر
منداڵێک لەگەڵێکدا زمانی
تایبەتی بە خۆی یان فێر نەبووە یان
لە بیر براوەتەوە . لە ناو
بۆتەی ئەو بیانیەی زمانەکەیان
فێر بووە تواوەتەوە .

لەو قەرارەی ئەمان لەو
هەموو ماوانە بە لەز و
هەڵەداوانە ویستوویانە زمان
و فەرهەنگەکەمان بنەبڕ کەن
و کورد سڕ کەن و گیان و
دڵی لە فەرهەنگی خۆیان پڕ
کەن.ئێمەش لۆژ لۆژ وەک
دەگوێی گادا خەوتبین و
لەو بیرە دەرنەکەوتبین کە
ئەوان رۆیان هێشتووینێ ،
نەشمانزانیوە چ باسە . چۆنە
تائێستا هەر ماوین و
یەکجارەکی نەفەوتاوین؟....
کورد گوتەنی تەگبیر و تەغدیر
لێک جودان هەموو شت
بەدەستی خودان.خوا ویستوویە

# یادی مامۆستا سەججادی

ئامیانی ژیانمان بمێنێ ، چەند کەسی وا بخولقێنێ ،زۆر گوێ نەدەنە نان و ئاو ،بێبەرگ و پێڵاو رابوێرن لە گۆشت و پلاو واز بێرن . دڵ دان بە کیژی دنیایی، ئەوینی پاکی خودایی، خۆشەویستی زێد و خزمان هانیان بدا هەستی ناو دڵ و هەناوان بە زوانەکەی دای و باوان بدرکێنن رووپەڕانی پێ بڕەنگێنن ، رەنگە لەبەرخۆ گوتبێتیان؛ خۆمانەبێ و دۆمانەبێ ، نەک بە زوانی بێگانە بێ ....

. جزیری و خانی سەرپلی کوردی نووسینیان خۆش کرد و بەرەو دوای یەک بوێژانمان داویانەتە سەر ئەو رچەی ئەو دوانە بۆیان شکاندووین و ئەوانە تێیان گەیاندووین بە کوردی نووسین رەوایە .

ئەگەر چەند دەور و زەمانێک کورد هەر برێتی لە بەیت و هۆتەی کۆنە بوو ، دیسان شوکرانە بژێرین کە لە سایەی ئەوانەوە زۆربەی وشەی زمانمان پارێزرا و لە بارەی مەبەستەکانی جۆرا و جۆری ئەدەب و ئەدەبیاتەوە زۆر هەژارتر لە خەڵکی تر نەماینەوە. خۆ دیاریشە پەخشان نووسین بۆ پاراستنی زمانمان لە شیعر و هۆتە باشترە .چونکە مەیدانی نووسینی نەسر و پەخشان تا بێژی پان و بەرینە ، نووسەر ریشی دەبەردەستی وەزن و قافیە و هەیت و هووتی‌تردا نیە ... خودا و راستان لەم چەرخی چاردەهەمینی ئیسلامیدا ئەم دەروەشمانَ لێ کراوە و پەخشان و داستان نووسمان لێ پەیدا بوون ، ئێستا کە زۆری وامان هەن ، بە هۆی نووسینی چیرۆک و گردەوەکۆیی دیرۆکان دەستەبەری هەرمانی کوردی یەکەمانن .

یەکێک لەو پەخشان نووسانە لە زەبرانە «سەججادی» بوو کە دەمەوێ یادی بکەم.

پێش حەفتا سال لە ماڵ مەلایێ سنەیی منالێک هاتە سەر دنیا ناو (علاء الدین)یان لێنا . ئەلف و بێتکەی پێ خوێندرا و نرایە بەر فەقێیەتی . بەنانی دەقنە ـ خواردن و بە ئالێ بابا رابواردن سوختە بوو بە موستەعید و موستەعید کرا بە مەلا . چۆن مەلایەک ؟ لە عارەبی و فارسی و کوردی وریا و پیتۆڵ. بەڵام جلک شڕ و شۆڵ و تەبەک و باخەڵ چۆڵ و هۆڵ. دەگەڕا بە شوێنی ناندا لە بەغدایە گیرسایەوە. لە سایەی چەند خێرەومەندێک بە گیرەگیرِ پێش نویژی یەکی لە کونە گورگێکا دەس کەوت کە ناو نرابوو مزگەوت. حوجرەیەکیشی بۆ جێ خەوی مەلا هەبوو. سەد خۆزگە بە حوجرەی نالی.من ناوم نابوو کونە رەش. بە رۆژ دەبوو چرا هەڵ کا. بە شەو چۆنی تێدا هەڵ کا؟. هەر خۆی و خودا بیزانێ .

ئاوارەیە ،غەوارەیە .گوناهی هەرە گەورەشی کورد بوونیەتی ساڵەهای ساڵ رۆژ و شەوی و کات و ساتی لەو حوجرەدا لەسەر حەسیر ببووە سیپاڵ .جا مەگین چلۆنکایی با دەنا هەرگیز ئەو زیندانەی جێ نەدەهێشت . هێشتاش هەر لەوە دەترسا کوردی نامەرد کە ماڵم هەقە زۆریش بوون، تۆمەتی ئێرانی بوونی بە ملدا دەن، لەپاش گرتن و جزیادان بۆ ئەو دیو سنووری رادەن . ئەو نانە وشکەشی بچێ کە ئێستا بێ منەت دەیخوا ...

جیا لە کاری پێش‌نوێژی‌یەکەی هەر پێنج فەرزان کە بە حال نان و بژیوی لێ دەردەهاتە بە رۆژ و بە شەو بێکار بوو. بێکار لە بەهەشتیش بژی وەڕەز دەبێ ، خۆی لەکن خۆی ناحەز دەبێ و قێزی لە خۆی دەبێتەوە.

خۆ نەمازە سەججادی کۆنە

گەڕیدەی دنیا دیدەی قسە زلی بە بالا چووکی والەش سووک بە بێکاری لە ژوورێکی رەش و برشی تەسک و باریک و و شەدار و ئاوا تنووک و تاریکدا دەس لەبان دەس کاریٚ نەکا . هەر دەشژی با مەرەکەف لە قورم و مازوو دروس کا، قەفە چیتک و کاغەزی کاش زۆر هەرزانە، با بەختی خۆی لە نووسین تاقی کاتەوە .

بەختی لەم ئەزموونە گرتی: بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری " گەلاوێژ"دا ناوی سەجادی خۆی نواند. نیزیک دەساڵ ئەم ناوەمان لەسەر بەرگ و ناوەرۆکی ئەو گۆڤارە بایەخدارە دەخوێندەوە. ئیتر بەری بەر هەمدانی کرایەوە، وردە وردە بووژایەوە، مێژووی ئەدەبیاتی کوردی ، باسی شۆڕشەکانی کورد، گەشت و گوزار نامەکانی،فەرهەنگۆکی بە عارەبی و فارسی و کوردی کتێبی رشتەی مرواری کە ئێژن بوویتە هەشت بەرگ، بەرهەمی (علاء الدین)ن . ئەمە جگە لە وتاری ناو رۆژنامە و راوەی شیعری شاعیران و زۆری‌تریش کە هەژماردنیان دژوارە.

زۆر سەبووری بەمن دەهات زۆر جار لە کونەرەشەکە سەرم دەدا. بەیتێکم بۆ وەرگێڕا بوو بۆم خوێندەوە :

**تۆ نەمردووی ئەی (علاءالدین)ی**
**سەجادی نەسەب**
**خاوەنی مێژووی ئەدەب ،پێش-**
**نوێژی پێخواسی عەرەب**

دەیگوت: ئەرێ پێخواسەکە منم یان پاش نوێژەکانمە!!

لەو ژیانە پڕ لە ژانەدا تەمەنی گەیی‌یە حەفتا ساڵ.. ئەو هیچ لەدەست نەهاتوانەی هەر ئیراد گرتن دەزانن و هەرگیز لە هونەر ناڕوانن کردبوویانە ئامانجی تەوس و توانج و زەدەیان لێ دەدۆزیەوە ولە یەکتریان دەقۆزیەوە :مەلا دەس رژد و چنۆکە ، ترسەنۆکە ،گۆشەگیرە ، لەم ناوە هەر خۆی لەبیرە ، سەر بۆ حوکمات دەنەوێنێ، لە مەجلیسی تەشریعی کە جاشخانەیە چۆن قەبووڵ دەکا بەشدار بێ و لە ناو کۆمەڵ لەکەدار بێ .

ئیتر سەرتان نەئێشێنم پێ هەڵگوتن بە دینار و غەیبەت کردن بە خەڵوار بوو ئەم بەدگۆیی و بە ناموێیی لێ روانینە تا دەمی ئاویلکە دانێ،تا دوا هەناسەی ژیانی دوایی نەهات . تا خەبەر هات کە مامۆستا ( علاء الدین ) عەمری خوای کرد ...

ئەمجار وەرە گوێ لە ئاخ و ئۆفان بگرە و لە داخی دوو زمانان مەمرە . هەر ئەوانەی بە زیندوویی کەوڵیان دەکرد ،شین و چەمەرەیەکیان کرد بە داستان بیگێڕنەوە . مخابن بۆ ئەو جوان چاکە جوانەمەرگە، لەوەتا پەلکی وەریوە هەموو کوردستان هەتیوە و سەد بەیت و بالۆرەی تریش .

خوشکی دڵسۆز، کاکی برا، نالێم زۆر، بەڵام هەر تۆزێک ئینسافتان بێ ، ئەو کەسانەی پیشەیان کوردی نووسینە و گەشە بە زمان و فەرهەنگی کوردی دەدەن هەتا ماون وا بە سووکی سەیریان مەکەن . کەموسکێک رێزیان لێ بگرن. واتا بە خوت و خۆڕایی نە جنێو نە پووڵیان پێ بدەن ، نە خراپیان پێ بکەن نەخێر... چونکە نووسەر ئەگەر فێری سواڵکەری بوو ، خۆشی و هونەری هیچ ناژین .

با ئاکارە نالەبارەکەی کەونارا بەروپشت کەین. نووسەرێک کە بۆ بەدبەختی هەر زیندووە خۆتان وای دانێن مردووە. ئەو پووڵ و پارەی لە یادی لاواندنەوەی پاش مردنی بەخت دەکرێ لە ناو خۆدا کۆی کەنەوە.کر و بەرهەمی نووسراوی هەڵسەنگێنن بینرخێنن ، هەڵە و پەڵەی ئەگەر هەیە لێ بژار کەن. بەو دەسمایە بۆی لە چاپ دەن ، لە فرۆشیاو پارەکەی خۆتان بە زیادەوە وەرگرنەوە لەو دزانەی بپارێزن کە

ل ٨٧ ←

# دلۆپە بارانێک

سمایلی قەزاق

لە دنیای تینووی خوێندا دەژین .تەمەنمان وەک دلۆپە بارانێکە لە ئاسمانەوە دێتە خوار، بێ ئەوەی خۆی بیەوێ و بزانێ لە کوێ دەکەوێ : لەسەر ئەرزێکی ئیشک و برینگ یا دەریایەکی پڕ پێڵ و شەپۆل ؟ لەسەر پەلکی گوڵێکی گەش و زیندوو، یا تەرمێکی سارد و بێگیان ؟ دەبارێتە سەر ئەرزێکی رووتەن و رەقەن یا بسک و هەنیەی کیژێکی جوان و شەرمین ؟ دەکەوێتە سەر چیایەکی بەرز و سەرکەش یا لە بیرێکی قووڵ و بێ بن ؟ وەک غەزەب تێکەڵاوی سێڵاوێکی بێ ڕەزا دەبێ یا دەبێتە هۆی رەحمەت بۆ کوژاندنەوەی ئاگرێکی بێئامان؟ بەرداشێک دەسووڕێنی یا رەشماڵێک دەڕووخێنێ ؟ کارگێک هەڵدەتۆقێنێ یا هێلانەیەک دەشێوێنێ؟بەهێمنی چڵە گیایەک دەبزێوێ یا گوڵ و گیا و شینکە وەک لباد دەپەستێوێ؟ لە باری غەمی ئاسمان کەم دەکاتەوە یا دەرد و زووخاوی زەوی زێدەتر دەکا ؟ خۆڵە ئەستێران دەشێرێتەوە یا بە ئاسەیە گزینگی هەتاو ببینێتەوە؟ لە گراوییەکەی کە پێش خۆی داباریوە ،دەگەڕێ یا لە ترسان خۆ لە هەوری دلڕەش هەڵداوێری؟ ئەسرینی گۆنایەک دەشواتەوە یا دەکرێتە قەنداو ،یەکێک لە مەجلیس دەیخواتەوە؟...

بۆی روون نیە ، ئەوانە هەموو پەردەیداهاتوویان بە بەرەوەگیراوە و نابیندرێن . بڵێی بە بیریدا بێ کە سەر لە نوێ دەبێتەوە بە هەڵم و دەگەڕێتەوە بۆ پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان ؟

ـ نا ،نا ،نا ،من دلۆپێکم خۆ داوێمە سەر باڵی شەماڵ و قەڵاندۆشی زریان، تەواوی لەشم دەکەمە هۆش و بیر، فەرامۆش ناکەم ئەودەمەی هێشتا لەسەر زەوی بووم و نەفریبووم و نەگەیبوومە هەوران ، وت و وێژی خاک و ئاونگم دەبیست ، خاک لە ئاونگی دەپرسی : تۆ بۆچی ئەو شوێنەت هەڵبژارد؟ بۆ تۆش نوقمی دەریای بێ سنوور نەبووی و تەمەنی تازە گووراوی خۆ دەکەی بە فرمێسکی سەر روخساری ئەو سوورە گوڵە ؟

ئاونگی ناو ئامێزی گوڵ وەڵامی داوە :من لە کازیوە دا تەمێک بووم ،دیم ئەو گوڵە سوورە بەو هەموو جوانییەوە لە خیزەڵان و لەبەر هەتاوی بەتین لە تینوان سیس و ژاکاوە .گوتم چی لەمە باشترە کە من لە قەدەر حاڵی خۆم بەرپێی تەڕبکەم کەچی پێش ئەوەی وەزەوی کەوم گرتمییەوە لە زمانی دڵم گەیبوو گوتی : بریا و هەزار بریا دلۆپەی وەک تۆمان زۆربا تاتوانیبام وەک تەڕەساڵان وڵات بخەمڵێنم و لە جێی ئەو دڕک و داڵەی رووان، دەور و بەر چواڕنەکاڵم بە تۆوی خۆم داچێنم. ئەونم گوتی: خاک، گوێت لە من بێ من خۆ دەبەر پێی ئەم گوڵە دەمرێنم تۆش چاکەم دەگەڵ بکە و خۆ شل کە با بگەمە رەگ و ریشەی ....

# جوغرافیای تەبیعی کوردستانی ئێران

## بەشی دووەم

جوغرافیای کوردستان

شەمیمی هەمەدانی وەرگێڕ: ع.ا. زەبیحی

لێرەدا کە بە پێشکەش کردنی بەشی دووەم لە جوغرافیای تەبیعی کوردستانی ئێران (نووسینی شەمیمی هەمەدانی، وەرگێڕانی ع.ا. زەبیحی) کۆتایی بەم بەشە دێنین پێویستە رابگەیەنین:

١ ـ بەشی جوغرافیای سیاسی و ئابووری ئەم کتێبە لەبەر هێندێک ئاڵ و گۆڕ کە لە سەردەمی نووسینی کتێبەکەوە تا ئەمڕۆ لە وەزعی سیاسی و ئابووری کوردستاندا پێک هاتووە، بۆ بڵاوکردنەوە نابێ، بەڵام هیوادارین بتوانین لە داهاتوویەکی نزیکدا تەواوی ئەو کتێبە بنێرینە ژێر چاپ.

٢ ـ دیسانیش داوا لە هەموو نووسەران و شارەزایانی جوغرافیای مەڵبەندە جۆر بە جۆرەکانی کوردستان دەکەین کە هەر کەس لەبارەی جوغرافیای شوێنی ژین و دانیشتنی خۆیەوە چی دەزانێ، بە شێوەی مەقالەیەکی زانستی و رێک و پێک بۆمانی بنێرێ، تا بە مەرجی پەسند کردن لە ژمارەکانی داهاتووی سروەدا چاپی بکەین. هیوادارین بڵاوکردنەوەی ئەم دوو بەشە لە سروەدا بووبێتە هۆی رێنموونی نووسەرانی لاو، هەم لەباری شێوەی لێکۆڵینەوەی زانستی‌یەوە و هەم لەباری ئەدەبی‌یەوە کەلکیان لێ وەرگرتبێ.

ج ـ کوردستانی سنە:

سنوور و کێوو چلۆنایەتی بەرز و نزمی:

کوردستانی سنە بەشێکە لە فەلاتی کوردستان، لە باکوورەوە بۆ جنووب و پانایی ٢٠٠ کیلۆمیترە، خاکی هەوشار و سایین قەڵا لە باکوور و مەڵبەندی کەرکووک و سلێمانی لە رۆژئاوا و دەراوی چۆمی دیالە لە جنووب و ویلایەتی هەمەدان و گەڕووس لە رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵات دەورەیان داوە.

کێوەکانی کوردستانی سنە بەگشتی رێک و پێکن، باری درێژ بوونەوەیان لە باکووری رۆژئاواوە بۆ جنووبی رۆژهەڵاتە، دوامین چیای ناڕێکی موکریان لە باکووری کوردستانی سنە زنجیرەی (چل چەشمە) یەکە سەرچاوەی چۆمە پڕ ئاوەکانی رۆژئاوای ئێرانە

لە جنووبی رۆژئاوای چل چەشمە زنجیرەکانی (گەرمیان) و (دانی قاشان)

و (کەللە سەر) بە موازاتی یەکتری لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا راکشاون ، لە رۆژئاوای کوردستانی سنە نێزیکی سنووری عێراق ، چیاکانی کوردستان لە مەڵبەندێکی نێوان کەرکووک و سلێمانیدا دەبیندرێن کە بە شێوەیەکی موازی تەواو چوونە پێش . زنجیرە گرینگەکانی بریتین لە : عەلیداغ ،قەرەداغ، سەگیرمە داغ، و ئیزمڕداغ (١٨) ئەم زنجیرەی دوایی بۆلای جنووب درێژ دەبێتەوە تا دەچێ بە کێوەکانی رۆژئاوای کرماشانەوە دەنووسێ و تەنیا چەمی دیالە دێتە پێش و زنجیرەکە دەپچڕێنێ .

لە باکووری چیای چل چەشمە کلکەی کێوەکانی بەناوی (تەکەڵتوو) لە جنووبی رۆژئاواوە بۆ باکووری رۆژهەڵات کشاوە و بە لێژایی‌یەکی کەمەوە دەچێتەوە سەر دەراوی چەمی ( قزڵ ئەوزەن ) (١٩)

کێوی چل چەشمە لووتکەیەکی گرینگی هەیە کە ( زێی گچکە )و ( جەغەتوو ) و (چەمی سپی ) لە دامانەی ئەوا هەڵدەقوڵێن و بە سێلای رۆژئاوا ، باکوور و باکووری رۆژهەڵاتدا دەڕۆن، بەڕاستی هەر وەکوو ناوەکەشی شایەدە دەتوانرێ چل چەشمە بە سەر چاوەی ئەسڵی هەموو ئاوەکانی کوردستان دابنرێ. کێوەکانی

دیمەنێک لە شاخەکانی هەورامان

هەورامان کەوتوونەتە جنووبی شاخی چل چەشمە و بەولاولادا راکشاون و بە پێچەوانەی چل چەشمە وشک و بێئاون و چەمێکی وایان لێنایەتە خوار کە گرینگ بێ .

بە شێوەیەکی گشتی کوردستانی سنە لە سێلاوە چیای بەرز دەورەیان داوە و تەنیا لە باکووری رۆژهەڵات، یەعنی دەراوی ( چۆمی سپی) بەرزایی فەلاتەکە روو لە نزم بوونەوە دەکا ، ناوەڕاستی ئەم مەڵبەندە لەچاو دەور و بەری خۆی نزمە و ناو بە ناو زنجیرەی چیا ، زەوی رسووبی پڕ حاسڵ و دۆڵی بەرین هەیە ، زوربەی دێهات و ئاوەدانی گەورەی کوردستان لەو دەرەو دۆڵ و زەوی یانەدا هەڵکەوتوون .

لەبابەت بەرزی و نزمی‌یەوە کوردستانی سنە دەکەینە دوو بەش .

١ ــ بەشی باکووری ـ دەشتێکی زۆر پان و بەرینی رسووبی‌یە ، بە شێوەی مام ناوەندی بەرزایی دوو هەزار گەزە و چەمی قزڵ ئەوزەن بەوێدا تێدەپەڕێ.ئەم دەشتە ئاو و هەوای وشک وبەژی‌یە (٢٠) رۆژئاوای زنجیرەی چل چەشمە و جنووبی کێوەکانی ویلایەتی سنە و چیای پەنجە عەلی‌یە ، ئەم کێوانە لە جنووب و رۆژئاوا بوونەتە مایەی ئەوەی‌کە چەمی قزڵ ـ ئەوزەن بەرەو باکووری رۆژئاوا جاری ببێ . لەو دەشتە پانەدا ئاودڕکی قووڵ هەن کە پڕن لە زیخ و چەو و زۆر بە پیتن،ئاوەکانی

دامانەی رۆژهەڵات و باکووری (چل چەشمە) و کێوی (دەربەند) و (تاهۆ خان) لە بەرزایی نێزیکەی چوار هەزار میترەوە بەم ئاودڕکانەدادێنە خوار و بە دەشتەکەدا دەڕۆن و لەو شوێنەی کە لێژایی کێوەکان لەگەڵ دەشتەکە دەبێتەوە یەک ئەوانیش یەکتر دەگرنەوە و بەشی ژووروو ی چۆمی سپی پێکدێنن و ئەو لقانە بە هۆی زنجیرە کێوێکی کەم بەرزایی کە ناوی (تاڵوانتوو) ە دەکرێن بە دوو بەشی رۆژهەڵاتی و رۆژ-ئاوایی .

لەو جێگایە کە رووبارەکان تێکەڵ دەبنەوە ئیتر چۆمەسپی بە زەوی خیسک(خیزک)دا دەڕوا و دەچێتەوە هەرێمی گەڕووس .

٢ - بەشی جنووبی - ئەم بەشە بە پێچەوانەی دەشتی باکووری تەواو کوێستانە و دۆڵ و دەرەی تەنگ و بەسامی هەیە ، بەشی زۆری ساڵ بەفر دایپۆشیوە ، چونکوو کێوەکانی ئەم بەشە یەک لە دوای یەک و بە موازاتی یەکتر هەڵکەوتوون و چۆمی گەورەش هەڵیان نابڕن ، کاری هات وچۆ و کشت و کاڵیان لە جنووبی کوردستان زەحمەت کردوە . سەرچاوەی تەبیعی دەوڵەمەندی ئەم مەڵبەندە لێرەواری تەنکن کە لە داوێنەکانی رۆژئاوای-چیاکان هەڵکەوتوون و خێڵ و کۆچەرانی جنووب و رۆژ اوای کوردستان کەڵکیان لێ وەردەگرن .

**چۆمەکان :**

دەتوانین چۆمەکانی کوردستان بکەینە : سێ دەستە

١ - لقەکانی ژووروو ی چومی سپی لە باکوور بە ناوی ( ساراڵ ) و ( هۆبەتوو ) و ( خوڕخوڕە ) و ( قەرەتۆرە ) ، کە بە ناوی ئەو ئاوایی و دێهاتانەی پێیاندادەڕۆن ناو نراون و لە نێزیک شاخی ( تاڵوانتوو )تێکەڵ بە لقی ئەسڵی ( چۆمە سپی ) دەبنەوە ، لقێکی‌تر بە ناوی چەمی لەیلا لە کێوی پەنجە عەلی رۆژهەڵاتی شاری سنە هەڵدەقوڵێ و تێکەڵ بە ( چۆمە سپی ) دەبێتەوە .

٢ - لقەکانی چۆمی‌جەغەتوو کە لە هەموان گرینگتریان چۆمی (سەقز) ە و لە (کەلی‌خان)ەوە سەرچاوە دەگرێ و مەڵبەندی سەقز پاراو دەکا. هەر لە (کەلی‌خان)ەوە چۆمێکی تر بۆ لای رۆژئاوا دەچێ و پاش پاراو کردنی (بانە) تێکەڵ بە چەمی کەڵات (٢١) دەبێ کە چۆمێکی سنووری ئێران و عێراقە و دوایە روو دەکاتە دەجلە .

٣ - لقەکانی چۆمی گەورەی دیالە کە ئەغلەب وێڕای چیاکانی کوردستان لە لە باکوورەوە بۆ جنووب دەڕۆن، لقی ئەسڵی دیالە لە چیای (شریش قان )ی نێزیکی (ئەسەد ئاباد)و رۆژئاوای شاخی (ئەلوەند) هەڵدەقوڵێ و لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا تا سنووری عێراق دەڕوا ، ئەم چۆمە هەموو زنجیرە کێوەکانی کە یەک لە دوای یەک و موازی بە یەکتر دێنە سەر ڕێگای وەکوو ( شاهۆ ) و ( کەللە سەر ) هەڵدەبڕێ و لەو ڕێبازە شاخاوی یەدا دۆڵ و دەرەی

چۆمی سەقز

قووڵ و پێچەڵپلووچ دێنێتە وجوود،کاتێ لە دۆڵەکانی (کەللە سەر) دەردەچێ ، بە لای جنووبی رۆژئاوادا پێچ دەکاتەوە و لەم حاڵەیدا دوامین زنجیرە کێوی سنوور دەبڕێ و ڕوو لە دەجلە دەکا .

سەرچاوەی ئەسڵی ئەو لقانەی لە لای راستەوە دەڕژێنە دیالەوە کێوەکانی کوردستانی (سنە)ن و ئەو لقانە برێتین لە چەمی سنە یا (میابوروان)کە لە باکووری رۆژئاواوە دێتە ناو شاری سنە و لە جنووبی رۆژهەڵاتیەوە دەردەچێ ، نیو فرسەق دوورتر لە جنووبی شار چەمی (قشلاغ) یشی تێکەڵ دەبێ و دەچنەوە سەر دیالەیەکی دی چۆمی هەورامانە کە لە سەرچاوەوە بە چەمی (ڕەزاو)مەشهوورە و پاش پاراو کردنی هەورامان لەگەڵ چەمی جوانڕۆ و رووباری مەریوان چۆمێکی گەورەتریان لێ پێک دێ و دەچنەوە دیالە، رووباری مەریوان لە دەریاچەی (زرێبار- زرێوار)دەر دەکەوێ. ئەم دەریاچە لە دەشتی مەریوانە،درێژایی فرسەق و نیوێک (٩ کیلۆمیتر)و پانایی فرسەقێکە و لە ئاوی ئەو کانیانە دروست بووە کە لە بنەوەی هەڵدەقوڵێن . لقەکانی چەمی دیالە کە بە خاکی کوردستاندا دەڕۆن برێتین لە: (لەهلەسوو) (٢٣) کە سەرچاوەی لە(شاهۆ)یە و(رەنگان)کە لە کێوەکانی (دالەهۆ) دێتە خوار و چەمێکی بچووکیش بە ناوی (زێ یا چۆمی زریشک) کە لە نێوان (دالەهۆ) و کێوی (داڕوو جان) دێتە خوار و دوو زنجیرەی گرینگی کێوی ئاسنگەران و بزەینان هەڵدەبڕێ . هەندێ لقی دیکەی دیالەکە لە کرماشانەوە دێن ئاوی حەلوان یا (ئاوی ئەڵوەند) ە سەرچاوەی ئەو چۆمە لە کێوی (تەختی گڕا) یە (٢٤) و لە بەرزایی ١٩٠٠ گەزەوە بە لێژێکی زۆر رژد دا لە چیاکانی زاگرۆس دێتە خوار و جولگەی (عەلی)و(سەرپێل) و (قەسری شیرین)پاراو دەکا و تێکەڵی دیالە دەبێتەوە.

**ئاو و هەوا :**

کوردستانی سنە ئاو و هەوایەکی سەختی بەژی هەیە ، زستانی زۆر ساردە لەم مەڵبەندە ساڵێ چوار مانگی پەیتا پەیتا بەفر دەبارێ ، لووتکەی بەرزی کێوەکان هەمیشە بەفر دایپۆشیون و سەرچاوەی چۆمە گەورەکانی رۆژاوان ، شوێنانی نزم و پێدەشتەکانیش تا ناوەڕاستی بەهار بەفریان لێ دەمێنێ ، جار و بار ئەستوورایی بەفر لەم جێگایانە دەگاتە دووگەز.. زستانان لای رۆژئاوای شاری سنە و شیوو دۆڵی کوێستانەکانی وەها بەفر دەیانگرێ کە رێبوار و هات و چۆکەر مەگەر بە دووکەڵی کە لە هەندێ دێهات هەڵدەستێ بزانێ ئاوەدانی لەم شوێنە هەیە . بەفری زۆر و سەرمای ئەم ناوچەیە کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ژیان و بەرێچوونی خەڵکەکەی. لە زستاندا دەشت و کێو بەفر دایدەگرێ و رێگاکان دەگیرێن و هات و چۆی نێوان دێیەکان بە تەواوی یەکی دەکەوێ ، بۆیە خەڵکی لادێی کوردستان لە هەموو جوتێر و لادێی ئێران زیاتر بۆ پێکەوەنانی سووتەمەنی و ئازووقە و جل و بەرگی زستانی بە پەرۆشن بە تایبەتی داختنی سووتەمەنی بۆ جووتێرانی کوردستان مەسەلەی مردن و ژینە . ئەگەر بە رێکەوت ساڵێک حاسڵاتی ناوچەیەک بەشی پێداویستی خەڵکەکەی نەکا، زستانێ کە رێگای هات و چۆ دەبەسترێ ، قاتی وقڕی یەکی گەورە پەیدا دەبێ و خەڵکێکی زۆر لە سەرما و لە برسان لەناو دەچن ،جار جارە قاتی هێندە سەختە کە جووتێرانی بێچارە دەکەونە گیانی یەکتر و یەکتری لەت و کوت دەکەن و دەیخۆن (٢٥) ،ئەم کارە هەر لە نێو جووتێرانی کوردستان روودەداو خێڵەکانی ناگرێتەوە ، چونکوو خێڵە

کوردەکان لە کۆنەوە گەرمێن و کوێستانێ دەکەن و خۆیان لە سەرمای سەخت و بەفری قورسی زستان و گەرمای برست بڕی هاوین ڕزگار دەکەن . ڕەنگە یەکێک لەو هۆیانەی کە لە گەرمێن و کوێستان کردنی خێڵەکانی رۆژئاوای ئێراندا کاریگەر بووە هەر ئاو و هەوا و هەندێ هۆی دیکەی جوغرافیایی بێ ، هەر وەکوو ئیمرۆش جووتیار و خەڵکی لادێ ماڵ بەجێ دێڵن و ژیانی کۆچەرییان بەلاوە باشترە تا ئەوەی لە جێگایەک نیشتەجێ ببن . بەڵام لە شیو و دۆڵە تەنگەبەرەکانی ناوچە شاخاوییەکان چونکوو زەوی بە پیت و بەرەکەتە و ئاو و هەواشی خۆشە ، ژمارەی دانیشتوانی دێیەکان لە هی دەشت و بەرکێوەکان زیاترە و ژیانی دانیشتوانی ئەم مەڵبەندانە دڵنیایی زۆرتر تێدایە ، هێندێک لەو شیو و دۆڵانە ،وەکوو بەشی ئەردەڵان ( لای رۆژهەڵات و جنووبی رۆژهەڵاتی کوردستانی سنە ) چونکوو تۆفانی پڕ تەڕ و تووشی رۆژئاوا لە کێوەکانی زاگرۆس دەدا ، زەوی تەڕایی زۆرە و هەوا خۆشە و لەگەڵ کشت و کاڵ و ژیانی لادێیی دەسازێ .

بۆمان دەردەکەوێ کە دەتوانین دوو جۆرە ئاو و هەوا لە کوردستانی سنە بەدی بکەین. یەکیان لە بەشی دەشتایی و شیو و دۆڵە بەرینەکان کە ئاو و هەوایەکی بەژی هەیە و لە گۆڕاندایە ،زستانەکانی زۆر سارد و سەختە و پلەی گەرمای لە (+۳۲) تا (-۲۲)لە هات و چۆ دایە ،ژیان لەم مەڵبەندەدا زۆر دژوارە و کار و پیشەی هەرە گەورەی خەڵکەکەی لە سەرەتای بەهارەوە تا سەرەتای پاییز پێکەوەنانی سووتەمەنی و داخستنی ئازووقە و ساز کردنی جل و بەرگە بۆ زستان. بەشەکەی دیکە مەڵبەندی شیو و دۆڵە تەنگە بەرەکانی ناو چیایە بە تایبەتی هی لای رۆژئاوای شاری سنە ، کە لە لایەکەوە کێوەکانی بە هۆی راکێشانی هەڵمی ئاو و تەڕایی،ئاو و هەواکەی بە مام ناوەندی رادەگرن و لە لایەکی دیکەشەوە سووتەمەنی زستانەی خەڵکەکەی لە لێڕەوارە زەبەند و چڕەکانی داوێنەی رۆژئاوای کێوەکان بە ئاسانی دەست دەکەوێ. ئەوەی لەبارەی ئاو و هەوای کوردستانەوە

ل ۹۸

۱۸ - ئەمەش نموونەیەکی دیکەی هەڵگێڕانەوەی ناوی عەلەمە لە لایەن هەندێ نووسەرانەوە.ئەگەر چی ئەمەی ئێرەیان ڕەنگە خەتای گێڕانەوە بێ لە سەرچاوەکان. لە راستیدا ئەو زنجیرانەی ، ئەو باسیان دەکا ئاوان :
ئاچ داغ ، قەرەداغ ، سەگرمە ، ئەزمر ، .
۱۹ - قزلْ ئەوزەن یا چەمی سپی کە لە کوردیدا ( قزل وەزان)ە ، لە کێوی چل چەشمەی کوردستانەوە هەڵدەقوڵێ و دەچێتەوە خاکی (گەڕووس) و لەودیوەوە بەرەو باکوور دەبێتەوە و دەچێتەوە مەڵبەندی میانە لە ئازەربایجان و هەر دەڕوا و چەم و رووباری دێنەوە سەر تا لەشوێنێک بە ناوی(حەسەن کەیا ) وە دەڕژێتە بەحری ( خەزەر)ەوە .
۲۰ - بەژی : مناطق بری .
۲۱ - وادیارە مەبەستی چەمی چەمان بێ کە سنووری ئێران و عێراق لە نێوان دوو مەڵبەندی ( بانە ) و (شاربازێڕ) و نیزیکترین ئاوایی کوردستانی عێراق بەرامبەر ئەو چەمە (شابە دین ) و لە کوردستانی ئێرانیش (ئەنجێنە )یە و نەمبیستوە کەس بەم چەمەی گوتبێ ( کەڵات ) و چۆمی ( کەڵوێ )ش لە سنوور نییە تا پیاو بڵێ مەبەست ئەویانە .
۲۲ - ئەم ئاوانە هەر یەکە لە مەڵبەندێک بەو چەمانە دەگوترێ و ئاخرەکەی دەبێتە دیالە .
۲۳ - ڕەنگە ( لەهلەسوو ) چەمی لالە بێ .
۲۴ - تەختی گڕا ڕەنگبێ تەختی گەڕیا تەختی گڕە بێ.
۲۵ - نازانم دانەر ئەم قسەیەی لە کوێ هێناوە .ئەوەی من بیستبێتم تەنیا لە گرانی ساڵی ۱۳۳۷ی کۆچیدا چەند ڕوودا وێکی ئاوا هەبووەئەم گرانییەش پێوەندی بە سەختی زستانەوە نییە بەر و بووی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو کە خاکی کوردستان ببوە پێخوستی لەشکری ئەلمان و عوسمانی و رووسی قەیسەری و خەڵکیان لە کار و کاسبی کرد بوو خەڵکێکی زۆریش بە ناوی (غەزا )وە دەسخەرۆی عوسمانییەکان بووبوون .

# دوکتۆر بیمار: سروەی نەرم و فینک

شەوێکی کورت و گەرمی بەهار و رەمەزان بوو.هەر لە دەفتەری ئینتیشارات سووکە بەربانگێکمان کردبۆوە و بە تەواوی برمان پێ نەشکا بوو. بەشێک لە دەستەی نووسەران، هەموو هونەرمەندان و کارگێرانی گۆواری "سروە" لە دەفتەر ماینەوە بۆ ئەوەی زووتر گۆوارەکەمان بنێرینە ژێر چاپ و خوێنەران رازی بکەین.

شەو درەنگان بوو، ئێمەش شل و شەکەت ببووین و برستمان لێ برابوو. یەک باوێشکی دەهاتێ،یەک وێژینگ و وەنەوزی دەدان،یەک چاوی خەوالووی دەگلۆفی، یەک پەنجەی ماندووی دەشکاندنەوە یەک لەبەر ژانی ئەژنۆی پاش هەزار جار گوتن ببەخشن لەسەر تەنیشت راکشا بوو هەر چوار لای بە پووشە و پاکەت و کاغەز هەڵچنرا بوو دەتگوت سەنگەری لە دەوری خۆی کێشاوە و بۆسەی لێمان داناوەتەوە، بە ئاستەم کاکۆڵە کورتەکان و ملە درێژ و باریکەکەی دیار بوو و بە سەرنجەوە خەریکی کاری فەننی بوو. کارەکەی زۆر ورد و گران بوو،کەچی نەزەری ئەدەبیشمان هەر لێ دەخواست و وەڵامی بەکەلکی دەدایەوە.

بەو حاڵەوە وەک چووبینە هەرەوەز و زبارەی ماڵە شێخ بە تاوانمان دەزانی وچان بدەین، وەک لەبەری دروێنە بەجێ مابین خۆمان دەکوتا و ئارەقمان دەرشت و دەفمان دەدا.

لە لایەک خرمەی مەقەستی کارناسەکەمان دەهات کە ئەوەی لە دەرەوە گوێی لێ بووبا پێی وابوو باخی سێوان هەرەس دەکا و لک و پۆپی زیادی وبن تایان هەڵدەپەرتێوێ

لە لایەک جیرەی قەڵەمی خەت خۆشە، رەزا سووکە،گوێ راگرەکەمان گوێ لێ دەبوو کە چونکە خۆی کورد نەبوو و رێنووسی کوردی نەدەزانی زۆر تووشی هەڵە دەبوو، لە لای دێکە تەرراحە مل باریکە، لاوازە، قۆشمەکەمان تەرحی جووجەڵەیەکی قەڵەوی چەوری لە ئیشتای کێشا بۆوە کە لیکی بە لالغاوەی ئێمەی خورێین و برسی و فێرە پارشەو و شەوچەلە خۆر دا دێنا خوار.جار جار رایدەناو گزوفتی دەداین،برایەکمان گوتی:" بەرخی بابم ئەگەر لە ماڵە خۆت شتی وات دەخوارد، تەرراحێکی کوردی دەبووی و هێندە لەر نەدەبووی بە مقاشگۆشتت لە بەدەن نەگیرا بایە" تێ نەگەیشت و گوتی: بۆ تەرراحی کێم ئەدی؟ هەموومان پێکەنین زانیمان ئەم وشە نارەسەنەی نەبیستووە کە لە زۆر جێگای کوردستان لە باتی لۆزەندەری رەسەنی کوردی، بە مانای زۆر زل و گەورە و نالەبار بەکار دەبرێ.

مامۆستا هێمنی پیری، نەخۆشی، بێ هێز کە ساڵی لە خوای بڕیوە، هەزار پەند و گۆڵمەزی دیوە و لەمێژ ساڵە لەبەر نەخۆشی دەمار و ژانی شان و پیلی دەناڵێ. بۆ هاندان و تەشویقی ئێمە بەم تەمەنەوە و بەم لەشە ناساغەوە شەو نخوونی دەگەڵمان دەکێشا و چاویلکە لە چاو و خودکار بەدەس چوار مێردەکی لەپشت مێزە نەوییەکەی دانیشتبوو و هەر تاوە ئاورێ لە لایەکمان دەداوە. هەر مانەوەی دەگەڵمان مایەی دڵخۆشی و پشتگەرمی و هیوامان بوو. بیرمان دەکردەوە ئەو کە لە هەرەتی لاوەتی یەوە خەریکی خزمەت بە زمان و فەرهەنگی

کوردی بووه و لەو ڕێگایە دا تووشی کوێرەوەری و دەربەدەری و خێشمە خێشمی زەمانە هاتووە، دەبێ چەند شەوی وای ڕۆژ کردبێتەوە ؟

بەڵام یاخوا بێ قەزا بێ و خوای لێ ڕەزا بێ، سیغاری بە سیغار دادەگیرساند و چرە دووکەڵێکی ساز کردبوو، دەتگوت ئاورگی بە ئاوردووی تەڕ هەڵکردووە بەڕاستی هەمووی وەک ڕێوی نێو کون قانگ دابووین .

پێم وایە دەیویست تۆڵەی دوێنێ بکاتەوە و بەشی سۆزیش نیکۆتینی کوشندە لەسی یەکانیدا پاشەکەوت بکا .

هیچمان لە ڕوومان هەڵنەدەهات پێی بڵێین ئاخر موسڵمانی خودای ئەگەر بەزەییت بە خۆتدا نایە ڕەحمت بە ئێمە دابێ . پێشمان گوتبا جگە لەوەی ژوورەکەی بەجێ بێڵێ چ قازانجێکی هەبوو؟ بۆ ئەو بە دەستووری دوکتۆری دەکرد؟ یا لە هەڕەشەی دایە خانم دەترسا ؟ تا بە قسەی ئێمە بکا ؟

ژووری کارێمان ئەوەندە شپرێو بوو، دەتگوت گای تۆڕ هەڵی ئاوێشتووە، لە لایەک قەڵەم، کاغەز، پەرگار، خەتکێش و گۆنیا پرژ و بڵاو بوون و لە لایەک چەسپ و فلێچە و شتی وا کەوتبوون، لە لای دیکە بڕشتە کاغەزی وردی لە دەنکە نیسک بچووکتر و لە زلە کا سووکتر لەسەر یەک کەڵەکە کرا بوون نەماندەوێرا پەنجەرە بکەینەوە هەموو لەشمان ئارەقە بوو، دەترساین پشوو بایەک هەم خۆمان باپەڕ بکا و هەم ڕێسەکەمان لێ بکاتەوە خوری و بڕشتە کاغەزەکانمان وەک تۆوی هەرزن بڵاو بکاتەوە .

لای پارشەوی، جێمان گوێزتەوە و لان بەرە ژێرمان کرد، چووینە دیوێکی دیکە کەمێکمان هات و چۆ کرد، چاومان شوت بۆ پارشەو چووینە سەر سفرە دەگەڵ بەربانگ فەرقی هەبوو، خواردنێکی چەور و گەرم و نەرممان خوارد، چەند چای داغ و ڕەشمان پێ دا کرد . ئەوانەی سیغار کێش بوون وەک لۆک دووکەڵیان هەڵمژی حەساینەوە، مامۆستا چەند بیرەوەری خۆش و نوکتەی جوانی بۆ گێڕاینەوە، من هەر ئەو دوانەم لەبیر ماون؛ گوتی :

" ماڵمان لە لاچین بوو، زۆر منداڵ بووم، مامەکانم پیاوێکیان بوو، حەسەن بایزیان پێ دەگوت .لەبیرمە زۆر هەژار و ڕووت بەڵام زۆر بێ تەماع و پاک و ڕاست و دروست بوو، ئەو پیاوە یەکجار قسە خۆش بوو لە ڕاو دا بە تایبەتی لە ڕاوە کەرویشکدا زۆر شارەزا و پسپۆڕ بوو .جارێکی چوو بوونە ڕاو، پاش .ڕاو بەتاڵ بە بوولێڵی بانگی شێوان کلە حەسەن تەماڵێک دەبینێتەوە، مامم پێی دەڵێ تاریکە و تاژییەکان ماندوون بە تفەنگ لێی بدە، کاکە حەسەن زۆر دەچێتە پێش، سێرە و چفتەی لێ دەگرێ چەپ و چیڕ دەبێ. تفەنگێکی پێوە دەنێ سەر دەکا و نای ئەنگێوێ . مامم تووڕە دەبێ و دەڵێ : هەک کوێرایيت دایە جاوەرە لەو بن و پاڵەوە نەنگێوی ؟ کاحەسەن دەڵێ : قوربان تووڕە مەبە، ئەگەر نەشم ئەنگاوت تەرخی ئەو کێوەم پێ کرد . "

دیسان گوتی :

" مامۆستا هەژار دەگێڕێتەوە و دەڵێ قەدیم من و مامۆستا حەقیقی ماڵمان لە بۆکان بوو، کابرایەکی لێ بوو شتی سەیری دەگوتن و ناوی نابوون شیعر . بۆی دەخوێندینەوە و ئێمەش گاڵتەمان پێ دەکرد، تا قانیع هاتە بۆکان، ڕۆژێک قانیع کەمێک دوورتر لە ئێمە دەگەڵ چەند کەسی ئەدەبدۆست لە دەوری حەوزی بۆکان دانیشتبوو، کابرا بە بەر دمی ئێمەدا هات .سڵاوی نەکرد و کۆخی یانی ها .. چووە لای قانیع و دەستی بەخوێندنەوەی

ل ٨٧ ←

مینئەت ژ خودایێ کو ب عەبدێ خوە مەلایێ
ئیکسیری غەمی عیشق نە دینار و درەم دا

( مەلای جزیری )

گوڵ بە تۆزێ پیتەوە لاف و گەزافی لێ دەدا
وا شوکر سۆزەی نەسیم هات وئەویشی لێ ستاند

حەریق * * * *

لەسەرخۆ چوونە شەیدا بوونە قوڕ پێوانە سووتانە
هەتا مردن مەحەببەت .ئیشی زۆرە ریزی لێدەگرم

مەحوی * * * *

نیە دیدەیی چ مەردوم ، نیە مەردومی چ دیدە
لە فرووغی خەددی فاریغ ،لە خەیاڵی خاڵی خاڵی

( نالی )

# داغی غەم

پرتەوهەکاری

مەدل بەو ئاگر و نیرانە دیسا
جەگەر ژی تازە من بریانە دیسا

نەشێم ئیدیت ئەوان دەردێت بێحەد
بکێشم ، لەو بە زەرب و زانە دیسا

نەبوومە ئەز ژ وەسلێ بەرخوری کام
خویایە وی ژ نەو بوحرانە دیسا

ژ غەیری داغی غەم ، نینە دەوایەک
کو سەردا دەردی بێدەرمانە دیسا

دلی من کاسەیا سەرپۆشدارە
تژی دەرد و غەم و کۆڤانە دیسا

لە سەنگی دت هەرۆ سەد شیشەیی عەهد
ژ نەو قایم تکت پەیمانە دیسا

پەریشانم ژ وێ زولفا پەریشان
بە پیچ و هەلقە وەک داڤانە دیسا

دلی من لەو لە ئاتەش چون سپەندە
لە روویان خالی عەنبەر دانە دیسا

ڤەنا پرسیت چیە حالێتە "پرتەو"
وەها بێ سەبر و بێ سامانە دیسا

# شیعر چییە؟

شاعیری ناکام ، سەدیقی مەحموودی

شیعر ئەبێ ئەوەن گەرم بێ وبەتین وەک ئاگری گەش
بدانقورچی مچوڕک و تەزین لە ئەندامی لەش
وەک فووی رووحی خوا گیان وەبەرهێنی پەیکەرەی هەست بێ
ئیلهام بزوێنی دڵی نەدوێنی ئاڵۆز و پەست بێ
وەکوو تەوژمی گیان بێ لەنێو دڵ هەر بێت و بڕوا
بەرەورووی ئامانج دڵ بێنێتە چڵ بە تین کا بڕوا
لە رێی خەباتا وەک سەرچاوەی تاو مێشکی بپڕژێ
دڵۆپی گەرمی پرشنگی لە ناو کومەڵا بڕژێ
شیعر دەبێ لەگەل خولی رۆژگار نوێ ببێتەوە
تا نەغمەی لەناوگشت مێشک ودەمار بزرنگێتەوە
ببێتە تارای بووکی شەرمینی رازاوەی ئاوات
بووکێک کە زاوای دڵ پڕ ئەوینی بەختیار ئەکات
نوێنگە و دیاری تەرزی ژیانی گەل و گورۆ بی
لە مێژووی ژینا بۆ دوارۆژەکانی وەڵامی بۆ ؟ بێ
وەک ئاوی کانی خیزەڵانی لێژ روون و رەوان بێ
ئەنجا با خوای تەخت و بارەگای شیعر و سەلیقە
بۆ بەختیاری و پیرۆزی بڕوای بدا لە تریقە

## هامن

ها من ، ها ، من وار ، گەرمیش جۆش ئاوەرد
فەزای نەزم بەزم نەو گولاڵان بەرد

بووڵ وە یانەی جەم نەوگوڵاڵان شەند
چەمەن بێنەوای ناڵەی بولبوڵ مەند

تای بەڕەزای شەنگ نەسای موغاران
شێونا چون زوڵف تەعزیەداران

ها ، کاوان ، کاوان دڵ چون دڵ ریشان
هەڕ دان وە سەردا هەردان پەی ویشان

دووڕیت ئایر وست وەیانەکەی من
یانێ یانەی دڵ ویرانەکەی من

## مەولەوی

هەوا ئایرین ، سەرووەخت ئایرین
دڵە ئایرین ، بەربەخت ئایرین

وەی گشت ئایرەوە خەیاڵم خامەن
بەختم ناپوختەن فامم نەفامەن

وەی بڵێسەوە گەردێم باقی یەن
وادەی ئایرین بادەی ساقی یەن

بەشق پیاڵەی مەست چاوەکەت
بەو پەشێوی چین پای کلاوەکەت

با بەی مەی بەڵکم ئایر مەستی
سۆچنۆ یەکسەر خاشاک هەستی

---

جەعفەر قولی زەنگلی ، عارفی پایەبەرزی کرمانج کە سەد وپەنجا ساڵ لەمەوبەر ، بە دەربەدەری و ئاوارەیی لە کێوەکانی خوراسان بێسەر و شوێن چووە ، بەسەرهاتێکی بەسۆز و دڵتەزێنی هەیە ، ئەو کوردێکی تایفەی زەنگلانلووی عێلی کێوانلوو بووە کە نیشە جێی چناران و دەرگەز و کەلاتی خوراسانن، بە لاوی ئاشقی کچێکی ( ملواری ) ناو دەبێ و چونکە نایدەنێ،لەتاوان دەس رەکێوان دەدا .

وا بە بۆنەی جێژنی قوربان سێ بەندی شیعرە بە ناو ـ بانگەکەی بلاو دەکەینەوە. وێڕای سپاس لە کاک کلیما .. توحدی کە ئەم شیعرەی بۆ ئێمە ناردووە ، هیوادارین بتوانین بە وەختی خۆی ئەم شاعیرە بناسێنین .

ئیسروولە کوویێ وەفا ، خەلیلێ دل نوورانی
ژە ئەمری فەردی دانا ،ئیسمایل کر قوروانی
لە ئارێ سەفا ، مەروە ، بنیشێ کەبە دانی
عەرز کر پەروەردگارا ، حەکیم و غەیودانی
لە پاداشی قێ کارا ، چی لوتف و کەرەم زانی
نەدا هات کێی ئیبراهیم ،گەر تۆ بەندێ فەرمانی
بورهان پووشیدە کە ، زیافەت کە میهمانی
پەس خەلیلێ موقەددەس ، میهمانسەرا بەنا کر
بیدوونی موسافیر و تەعام خوران ئەبا کر
لە عەوەزێ ئیسمایل ، قووچی قوروان فەدا کر
حەق نووری موحەممەدی،لە سولبێ وی عەتا کر
چما کو ژە رووی ئەزەل خەتمێ رەسوول پەیدا کر
گشتی رەسوولی سابیق ژە نووری وی جدا کر
دل دەخازێ تووسیف کە، وی حەبیبێ سوبحانی
خادێ وە توفێلاوی ، بەنا کرین دو عالەم
ئەقەل سەبتی دەفتەر کر ،ناڤێ وی لووح وقەلەم
لە چەندین هەزار سال ،پێش ژە خیلقەتی ئادەم
مووجوود بوو ،ئەو ،نووکورسی نار و جەننەت لە عەدەم
میری یەسریب و بەتحا ، هیڤێ مەکە و حەرەم
سەروەری گشتی عەرەو ، خوسرەوی کوللی عەجەم
رەحمەتی لیلعالەمین ، نوورێ پاکی یەزدانی..

# نامەیەکی پیرانە

دیسان کەوانی قەڵەم بە دەستەوە دەگرم هەتا لە شیناوەردی هەوای تۆدا هەوێردەی هونەر راوکەم و بیخەمە نێو رکەی کاغەز و بە دێڕ و رستەی کورت و درێژدان و داوی وێگرا بدەمێ. ئاخ کە سەردەمی لاوەتی چەند خۆشە. ئەودەم کە جێژوان و دوان بۆنی خۆشی و ئەوینی لێدێ و مۆمی تەمەن بە سستی دەسووتێ و سیرەی سیڕوو و سریوەی سریلە هاودەمی سەردەمی چاوەڕوانین. بە کورتی سەردەمی لاوەتی یادی بەخێر !!

ئەگەر ئەویندار بی تەنیا لە بیری ئەوەدای کە لە چاوەڕوانی دوور بی. وەک قرژاڵ بە دوو سەر بڕۆی هیچ‌تلێ‌عەیب نیە بەڵام ئەگەر ماوەیەک رابرد و هێندێک لە نێوەوە چووی ئەودەم ئیدی ژاری ژینی ژەنگاوی رۆژ ژمێری تەمەن بە گەرووتدا دەڕواتە خوار و هەرچی دەیکەی و دەیخۆی لێت وەعەیب دەگەڕێ. دەبێ بێ هەراو هاوار چاوەڕوانی چرای فوو پێدا کراوی تەمەن بی کە کەی نەوتی لێ دەبڕێ.

بەڕاستی لەوەها سەردەمێکدا ئادەمیزاد ئەویندار دەبێ؟ دەبێ ئەوینی پیری چۆن بێ؟ بەرامە و تام و چێژی دەبێ چ بێ؟ بڵێی هەستی ناسک و بێ خەوش و ئاسکی رەوەکی نیگای هەراو بکەوێتە سەر بار و بخرێتە بەر تیری قەزای چاو مەستی گراوی؟ بڵێی هەناسەی، تاسەی ژیانەوە بێ یان کاس و مەنگی بەنگی دەنگ و باسی دەور و بەری بێ کە چەند جووتە چاوی زیت چاویان لە چاوی بڕیوە...

ئێستا رێگای ژینم بە تەواوی نەپێواوە و وردە وردە دێم و دەڕۆم. پاش چەند ساڵ دیسان هەستی بزۆزم جووڵاوەتەوە بەڵام بۆوەی بێت و بڕوا دەبێ گۆچانی پیرەوەری بدەمە دەست. رەشماڵی ئەوین ئەستوندەکی تاوڵی لەسەر کوێستانی دڵم دا کوتاوە و وەک میوانی ناشارەزا لێم وەژوور کەوتوە. نازانم بڵێم چی؟

ئەودەم کە هەڕەتم بوو

تەنیا بۆ جارێک دڵم نازدارێکی گرت و ئەو گرتنە گرتنی بە شوێندا هات، هەتا گۆشەی نیگای ئاشنای ئەم خۆشەویستە لە چاوان نادیار کرا و بەرەو دیاری نادیاری چارەنووس وەڕێ کەوت .ئیتر لەمەو لا نازانم چم بەسەر دێ . لەو رۆژەوە هەرچی دەینووسم بۆنی ئەوی لێدێ و هەرچی بە دڵمدا دێ خەیاڵی تاڵی ناڵە ناڵی سەردەمی ئەویندار ی و بێقەراریمە .

دیسان باش بوو ئەو دەم لە پێوانی مەودای نێوانی خۆم و گراوی ماندوو نەدەبووم بەڵام ئێستا دڵی بێ تین و تاو و لە سەد لاوە شکاوی من شەکەتی پێواری دەشتی هەراوی ژینە و ماندووی ناحەسێتەوە و دەراوی روونی مەندی جووتە چاوێکی لێ ونە، هەتا چۆڕە ئاوێکی ئەوینی لێ بخواتەوە. ئەگەر جوانی لە خۆرسکدا دەبینم وەک سەردەمی لاویم بە چرۆی دار دڵم ناگەشێتەوە بەڵکوو لکی دارە کە جێگای هیوا و هەوێنی هومێدمە چون دەبێ بە دار عەسای دەستی لەرزۆکم ئەگەر جوانی لە دیمەنی بەژن و باڵای کیژێکدا دەبینم بە چاوی بابێک چاوی لێدەکەم و ئەگەر زاری هەڵبڕێ و بمدوێنێ تەنیا وشەیەک لە زاری دێتە دەرێ ئەویش ئەوەیە: چت دەوێ مامە!!! جا بە بیستنی ئەو وشەیە دێڕی جوان و نەشمیلانە و خنجیلانەی خۆشم دەوێی هەتا هەتایە لە نێوان زار و گەروومدا وەک گۆمێک پەنگ دەخواتەوە و بڕستی دەربڕینی لێ دەبڕێ .

تەنانەت وەک مەولەوی
خاڵۆ خاڵۆ تەن کەم واچە خاڵۆ
خاڵۆ دەم وەبان خاڵانت ماڵۆ

بەڵام چبکەم دڵە و ئەوانە نازانێ. ئێستا کە دەتەوێ نامەیەکت بۆ بنووسم، باشە! بەسەر چاو ئەوەی لە دەستم دێ کۆتایی ناکەم و هەرچی لە جانتامدایە هەڵی دەڕێژم بۆوەی بەسەری پیری تووشی درۆیە نەبم لە پێشدا هەستی دەروونم باش بناسە و دوایە پرێسکەی دڵم بکەوە ، تاقە ترووسکە و تریفەیەکی کە لە ئەویندا ماوە و لە بەرابەرمدا زیتەی دێ بە شاهید دەگرم کە درۆت لەگەڵ ناکەم. حافزی شیرازیم خۆش دەوێ لە نێو لاپەڕەی بیرەوەری یەکانی ئەو شاعیرە دا هەست بە هێمنی دەکەم. دەبینم کە ئەگەر تەنانەت بۆ جارێکیش بێ دەردی منی بەسەر هاتووە و هاواری کردووە کە ئەویندارم و دەمەوێ ماوەیەکی دوور و درێژ ئەو رازە لە ژێر چارشێوی نهێنیدا بشاردرێتەوە .

بەڵام وادیارە کە ئەو چاوانەی بە درێژایی تەمەنم لەگەڵم راهاتوون و بۆ دیتنی هەموو مەبەستێک لەگەڵم هاتوون خەریکن لێم ئاشکرا کەن و لێم لە هەڵڵا دەدەن :

دل میرود زدستم صاحبدلان خدا را
دردا کە راز پنهان خواهدشد آشکارا

بەڵێ خۆشەویستم :زەمانێک بوو شانازیم بەوەی دەکرد کە دەیانگوت فلان کەس ئەویندارە و بەدەردی ئەوینەوە دەناڵێ بەڵام نا ئێستا هیچم لە باراندا نیە و لە تەبیعەتی دڵمدا زستانە و لەو زستانەدا لە هەر دەوە بەرەو ئاسمان بەفر دەبارێ و تەم و مژی هەناسەم وڵات دادەگرێ .جا کەوابوو ئیزنم بدە بێئەوەی سڵاو بکەم ماڵ ئاواییت لێ بخوازم. سەردەمێک بوو دەگەڕام و لە دەریای مەندی هونەردا لەنگەرم دەگرت و لە داوێنی جوانترین شیعری هەڵنەبەستراو و دانەندراودا ئۆقرەم دەگرت و بۆ سەردێڕی نامەکەم جوانترین شیعرم دادەنا و بۆ دڵداری بێ بەزەیی و بێبەزەم دەنووسی .

بەڵام ئێستا ... گلەیی و سکاڵایە و بەس ... تازە هەڕەتم نیە! چۆن نامەی نووسراوت بگەیەنمێ . ئاخر تازە شەماڵ نۆرەم بۆ ناکا و زریانیش هیممەتی نیە و خۆش لەبەر بای سەڕ سەڕ ناگرم ،چون جارێک گوڵی گوڵستانی ژینی بە تاڵان بردووم .جا نامەیەکی نەبتوانم

ل ٩٣ ←

**عەزیزی فازیلی**

حەسارێکی گەورە و پڕلە دار و درەخت ، حەوزێکی گەورەی تێدا بوو ، وێنەی دارەکانی لە ناو حەوزەکە دا وەک دوو پۆلە داری سەراوبن لە حەسارەکەدا دەهاتنە بەرچاو . مینای ژیکەڵە و کار جوان ئەوێ روژێ لای نیوەڕۆ بە دڵگەرمی‌یەوە لە قەراغی ئەو حەوزە هەڵترووشکابوو و چەند کوتە جلکی ماڵی زارا خاتوونی دەشوت . بەدەستە بچکۆڵەکانی پەڕۆوپاڵی منداڵە ساواکەی خاتوونی هەڵدەپشاوت . جار نا جارێک سەری هەڵدێنا و بە حەسرەتەوە چاوی لەو قەلەڕەشە دەکرد کە لەسەر چڵووکی دار چنارەکە دەیڕوانیە خوارێ .چاوێکی بەم لاو ئەولا دادەگێڕا و دیسان تەشتەکەی هەڵدەنا .بیری ئەوە کە ئەو قەلە چی لەو تەشتە دەوێ، زەینی مینای ئاڵۆز کردبوو .

جارجارکە دارەکەدەلەرییەوە قەلە ڕەشە دوو سێ جار باڵی لێک دەدا و دیسان چاوی لە تەشتەکە دەبڕییەوە .

دیاربوو دەیویست داکشێتە خوارتر و بێتە قەراغی حەوزەکە و هەڵنیشێ بەڵام لەترسی مینا نەیدەوێرا .

مینا لەبەرە خۆیەوە دەیگوت: " ئەم قەلەڕەشە هیچ شەرم ناکا!هەر دێ و خۆی لە تەشتەکە نزیک دەکاتەوە نازانم بۆ چی !!چی دەوێ ؟ لە پڕ نەیە دندووکێک لەسەرم دا " هەرکە ئەو بیرەی بە مێشکیدا هات ، پەشۆکا ، هێندێکیش ترسا . هەر بۆیە پاش ئەوەی هێندێکی تێڕاما و تێی ڕاخوڕی ، چووە بن دارەکە و دەستە کەفاوی یەکانی ڕاوەشاند بەو کارە دەیویست هەڕەشەی لێ بکا کە قەلەڕەشە بڕوا و لێی دوور کەوێتەوە . قەلە وەک لە مینا حاڵی‌بووبێ پاش هێندێک باڵەفڕکە بەرەو سەرتر هەڵفڕی .

ئەوجار مینا بە خاترجەمی چۆوە سەر تەشتەکە و دەستی بە جلک هەڵپشاوتن کرد .

لەو کاتەدا دەنگی زارا خاتوون بەرز بۆوە.هاواری کرد و گوتی : مینا ئەو چەند کوتە شیوەش‌لێرە ماوە وەرە بیانبە " مینا دەستی بە بەرهەڵبێنەکەی ئەستری و بەرەو ژوور وەڕێ کەوت . قەلەڕەشە وەختی بە دەرفەت زانی و هەر کە چاوی مینای لێ ون بوو ، لوور بۆوە و رامالی بردە سەر پاروە سابوونە بۆنخۆشەکە ،ئەوجار کە بە ئاوات گەیشتبوو لە شەقەی شاباڵانی دا و لە چاوان ون بوو .مینا کوتە جلکەکانی هەر بەدەستەوە بوو، هاتەوە قەراغ حەوزەکە ' چاوی لە قەلەڕەشە کرد بەڵام دیتی نەماوە . دڵی خۆش بوو کە توانیویەتی بە هەڕەشە قەلەڕەشە بتارێنێ .

مینا هاتە سەر تەشتەکە و داوێنی خڕکردەوە و هەڵترووشکا دەستی بۆ سابوونەکە برد بەڵام دیتی نەماوە سەری سوورمابوو واقی وڕمابوو ، نەیدەزانی پاروە سابوونەکە چی بەسەرهات لە پڕ وەبیری هاتەوە کارکاری قەلەڕەشەیە . لە نێو دەریای خەیاڵدا نوقم بوو .نەیدەزانی چ بکا ؟ لەبەرە خۆیەوە بیری دەکردەوە .

"ئێستا چ بە زارا خاتوون بڵێم ؟قەڵێک هەر ئێستا سابوونەکەی رفاند" بڵێی بڕوام پێ بکا ؟ نازانم پێی بڵێم یان نا ؟ ماوەیەکی زۆری بە بیر کردنەوە رابوارد بەڵام دەستی بۆ کار نەدەچوو. ئەو کارەساتە لە مێشکی بچووک و زەینی منداڵانە و دڵی پاکی مینادا نەدەگونجا .

پاش تاوێک هاتە سەر ئەو بڕیارە کە پارەوە سابوونێک لە ماڵی خۆیان بێنێ و جلکەکانی پێ بشوا لەوەی باشترە لە لای زارا خاتوون ئەو قسەیە بگێڕێتەوە .

کاتێک چۆوە ماڵێ دەرگای کۆمۆدە چەپرەکەی کردەوە و لە نێو بوخچەی دایکی پارەوە سابوونێکی پیوی خۆماڵی دەرهێنا ئیدی زۆر مەحتەل نەبوو ،خۆی نەگنخاند. بە پەلە خۆی گەیاندەوە ماڵی زارا خاتوون .

ئێوارە داهاتبوو لە شیو و کوڵ ببۆوە.جلکەکانی لە ئاو هەڵکێشابوون و هەڵیخستبوون. بۆ ئەوەی کارەکەی بە زاراخاتوون نیشان بدا ، هەرای کردێ ، بەڵام زارا خاتوون لەسەر پەنجەرە دوونهۆمەکەڕا گوتی: " مینا کچم وەرە ئەو پلە گۆشتە برژاوە بخۆ دوایە بچۆوە .

لەو بەینەدا کە مینا لە پلیکانان وەسەر دەکەوت، زارا خاتوون بیری لە رەزا- سووکی و کار جوانی ئەو کیژۆڵە منداڵە دەکردەوە . دەیدیت کە چەند بە رێکوپێکی شیوەکەی کردووە و دوایە بە تەنافیدا داوە .

مینا گەیشتە ئاشپەزخانە ، بەڵام لەبەر دەرکە لە شەرمان سوور هەڵگەڕا . زارا خاتوون کە زانی لە شەرمان وای لێ هاتووە گوتی :"رۆڵە مینالێ ئینسان لە ماڵی خۆی شەرم ناکە ها وەرە ئەو گۆشتەی بخۆو دوایە بچۆوە کچم ."

"چەند پلە گۆشتی بۆ کردە بابۆڵە و لە نێو دەستە پیرە لۆکەکانی مینای راکرد. مینا بە دڵێکی پڕ لە جۆشەوە بابۆڵە گۆشتی خوارد و بەرەو ماڵ وەڕێ کەوت .

ماوەیەک دوای رۆیشتنی مینا، زاراخاتوون لە پلیکانان هاتە خوار هەتا ئەوانەی وشک بوونەوە کۆیان کاتەوە . هاتە سەر لێوی حەوزەکە لە پڕ چاوی

بە پارەوە سابوونێکی بۆری چڵکن کەوت . لەوانەی کە تەنانەت بێزی نەدەهات دەستیشیان لێ بدا لەنەکاو ئەوەی بە مێشکدا هات :

"دەی دەی کە وابوو ئەو کیژۆڵە ساکار و بەستەزمانە ئەو جۆرە کارانەی لە بن سەریدایە .سابوونەکانی من دەگۆڕێ و دەیانبا وەیانفرۆشێ و لەباتیان ئەو سابوونە پیسە بۆگەنانە لەکار دەکا وەڵڵاهی وای ناخۆی مینا خانم !"

کاک رەشید تازە هاتبۆوە ماڵێ.زۆری هەستبەماندوویەتی دەکرد. دیتی خێزانی تێک چووە. رووی تێکرد و گوتی : "خانم ئەوە بۆچی وانارەحەتی ؟ چ بووە ؟"

ـ جا دەتویست چ بێ؟ مینا خانم چەند وەختە شیووکولمان بۆ دەکا هەر سابوونە بۆنخۆشەکان دەدزێ و ئەو پیسانەی لە جێ دادەنێ .

"ـ دەی جا دەتەوێ چبکەی؟

ـ هیچ هەر ئێستا دەچم بە دایکی دەڵێم من جلک شۆری وام ناوێ "

ـ"زۆر باشە کارێکی زۆر بەجێیە منیش سبەینێ لە ژێر هەورانیش بێ یەکت بۆ پەیدا دەکەم بێ شیوەکەت بۆ بکا."

ـ من دەربەستی سابوون نیم ،بەڵام مینا ئافرەتە ، ئەگەر هەر لە ئێستاوە فێری دەس پیسی بێ سبەینێ لە نێو کۆمەڵدا باش دەرناچێ و لە هیچ ماڵە مێردێکیدا بووکی دوو مانگان نابێ .

* * *

دایکی مینا لەوەی کەمینا بێدەنگ بوو، وەخت بوو وەزگ بدا .بۆ چەندەمین جار لێی دووپات کردەوە :

"ئاخر کچەتیوە سەرشینە بابان ویرانە ، بۆ هیچ ناڵێی ئەتۆ ئەو سابوونانە چ لێ دەکەی ؟" بەڵام مینای زار درواو نەیدەزانی بڵێ چی؟

"ئاخر مینا گیان بۆ پێم ناڵێی ؟ هەتا ئەمرۆ بە پاکی ژیاوم بۆ دەتەوێ لە نێو سۆرە و تۆرە و کەس و خزمان ئابرووم بەری؟

بەڵام مینا هەروا کرو کپ بوو. متەقی لەبەر نەدەهاتە دەر. تەنیا جارێک کە سەری بە هەنیسکاوە هەڵدەکەندرا گوتی :

"خەتای من نەبوو،مـ... ن دزی ناکەم .خە..خەتای قەلەکە ... بوو ."

شەو داهات.مینا بە دەم ئەو فیکر و خەیاڵاتەوە خزیە بن لێفە بەڵام خەو لە چاوی زڕا بوو،پرسیارێکی لێ دەکرا کە وڵامەکەی نەدەزانی.مەبەستێکی ئاشکرای دەدی بەڵام کەس بڕوای پێ نەدەکرد.کارەساتێکی بەسەر هاتبوو بەڵام نەیدەوێرا بیدرکێنێ. لەبەر خۆیەوە دەیگوت :

"راستی من شیوەکەم باش کرد،ئەدی بۆچی زارا خاتوون وا بەتوورەیی هاتەلای دایکم و گوتی سابوونی دزیوە؟"

"بریا کوتە سابوونەکەی پاش شیویم بردبا و لە چەلەنگی زبلێم هاویشتبا!"

"بریا قەلەڕەشە دندووکی لە چاوی من دابا "

ئەدی ئەگەر بابم بزانێ چم لێ دەکا .خۆ رۆحم بەرمە پەرپەرۆچکەی ئاسمانێ دەمکوژێ "

بەدەم ئەم بیرانەوە خەو بردیەوە . بەڵام لە خەویشدا هەر خەونی ئاڵۆزی دەدی.

* * *

بەیانی لەگەڵ دەنگی کەڵەشێر وەخەبەر هات.سەیری نوێن و بانەکەی بابی کرد ، نەمابوو. زانی بۆ نوێژی

ل ٤٧ ←

## ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

# سوارۆ

ئەی نایە وەی نایە دەی نایە
ئەوە کیژ دەڵێ نەلە چۆڵێ نەلە بەحرێ نەلە
بەڕیایە
نەلە کەناری دە کۆمەڵە سواران،
نەلە عێلی دە بەغدایە ،
نەلە گۆشەی دە وەتاغێ ،
نەلە بورجی دە قەڵایە ،
نەدەگەڵ حەزرەتی ئەبووبەکر ،
کە پانێی بە زاری هەژدیها وە دەنا .
لە غارەکەی دە عیڕایە ،
نەدەگەڵ حەزرەتی عومەری ،
کە بەزەبری حوکمی شیری ،
بانگی محمدی دەکرد ئاشکرایە .
نەدەگەڵ حەزرەتی عوسمانی ،
کە سەری وەسەر سوژدەی دەکرد،
سەری هەڵنەدێنان لەبەر ئەوێ حەیایە .
نەدەگەڵ حەزرەتی عەلی ،
کە سواری دوڵدوڵی دەبوو ،
زولفەقاری دەس دەدایە،
نەدەگەڵ خالندی بنیوەلی،
کە حەفتا لفکەی بەردەدان ،
لە بۆ ڕەزمی دە غەزایە ،

نەدەگەڵ رۆستەمی داستان ،
کە زگی بێزادی دەدڕی ،
لە مەیدانی دە دەعوایە .

* * * *

ئەی‌نایە وەی نایە دەی نایە ،
نەدەگەڵ حەزرەتی ئەسکەندەری ،
کە خەرجی دەستاند لە مانگێ لە رۆژێ ،
ماڵیاتی دەردەکرد لە دنیایە .
نەدەگەڵ حەزرەتی سولەیمانی ،
کە بەزەبری تەیرو تووران ،
سێبەری دەکرد لە سەر چاوی دە بلقیسایە،
بە حوکمی خوداوەندی میری مەزن ،
حوکماتی دەکرد لە چوار ئیقلیمی دە دنیایە،
هەی سوارە ..... مایەوە لەمن بەتەنێ.

* * * *

هەی نایە ، وەی نایە ، دەی نایە ؛
دەنگی چووکەڵ و چووکەڵە سوارێ من ،
لەمەیدانی دە کوڕە بەبەئیان نایە .
کیژ دەڵێ ئەوە سوارێ من دیارە ،
لە کەناری دە سواران لە چیایەکە تازی ،
هەر کەسانێکی سوارێ من ناس ناکا ،
سەر زینی ئەتڵەسە ، رکێفی وەک رووس‌کارە ،
دەستە جڵەوی لە قایشێکی دە بولغازی،
ئەوە هەڵی کێشاوە دەمەرقۆپانێکی دە کوڕە
سەربازی .
دەوەرە سوارە بەشقی خودا و رەسوان ،
سووکە سەفەرێکت لەبەرە بۆ دەشتی کەربەلایە ،
بچۆوە سەر مەرقەدی حەسەن وحوسێنان ،
دوایە گونبەزی حوسێنی غازی .
ئەتۆ ئەگەر دەچیەوە سەفەرێ ،
بۆ هیچ خودا حافیزیان لە من ناخوازی ؟
لە منی سەرشینی مل بەکوێنی بابان وێران ،
دەبێتەوە بەشینێ وگریان دوامەتی بە تازی،

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
ئەوە کیژ دەڵێ سوارە گەردەچیەوە سەفەرێ ،
ئەوەت وەسێت بێ لەسەر دەستی من :
ئەسپەکەی خۆت با ژوێ لە کەناری دەرێگایە .
رەبی سوارە بەدووربی لە ئەسپی ئەجەلێ .
لە شەڕی دەوێ پاش نوێژانە ،
لە تەپ وتورکومانی دەهەڵڵایە .
رەبی ئاگاداری چووکەڵە سواری من بێ ،
بیپارێزن دوعای بۆبکەن ،
دوازدە ئیمامی دەشتی بەغدایە .
ئەوە کیژ دەڵێ لەقرچەی دە روونی من ،
ماسیان ، دەعبایان ، نەهەنگان ،
سەریان دێنا دەرێ ،
لە گۆمی دەلیۆپڕ هەڵدە چۆقان ،
لێی دەدانەوە شیددەتی ئەوێ گەرمایە .
هەی سوارە مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
ئەوە کیژ دەڵێ سوارە ئەگەر دەچیەوە سەفەرێ،
ئەوەت وسیەت بێ لەسەر دەستی من :
بپەڕەوە لە چۆمی عوودێ لە دەریای عومانێ
ئەسپێکە خۆت با ژوێ لە کەناری سواران .
بریا سوار ئەمن خەبەری تۆم بۆهاتبا ،
بمزانیبا چۆن دەرچووی لەوێ جەنگێ لەوێ
دەعوایە .
ئەوە کیژ دەڵێ سوارئەگەر دەچیەوە سەفەرێ،
ئەوەت وسێت بێ لە سەر دەستی من :
سەری کەحێلێ خۆت بادەوە سەر دووکانیـــی
وەستا بۆمنـــی .
ئەوە نالانت بۆ دەبرم لە ئینترناڵی .
بزمارانت بۆ تەواودەکەم لە وردە ئاسنی،
ئەوە قەڵاتێکی گەورە وگرانە تۆی لەبنی .
ئەوە میرێکی زەڕەندەیە تۆی‌دوژمنی .
ئەوە سوارەی من هەڕای دەکردە ،
سەر سەنگەران ، سەر مەتەرێزان
بە دەستی خۆی دەی بڕیوە کەپۆ ولووتی،
زۆڵە بەگی دە داسنی .
هەی سوارە مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی‌نایە دەی نایە ،

هەر چەندی گازێی دەکەمێ نایە ،
مەتاڵ کەرگەدەنێ .
شیر لە غەزنەی شای فەرمانەدەی ،
لە خزمەت وەزیری‌دە بەغدایە ،
رۆژێکی ئەمن را وەستا بووم ،
لە بەر دەرکی ماڵە بابە وێرانەکەم لە حەسارێ .
لە هەیوانێ ، لە دالانێ،
ناوەڵڵا لە بەر بێلایە ،
چووکەڵەسوارەکەی من دەهات ورادەبرد ،
دەچۆوە سەفەری‌دەکاولە لەحسایە ،
داوای تەقە ماچێکی لەمن دەکرد ،
بە چاوی کوێرەوە زارم رەق دەبوو ،
بە سەری شین و ملی بەکوێنەوە ،
چ تاقە ماچم نەدەدایە .
هەی سوارە مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە
کیژ دەڵێ ئەمن ئەوەم نەدەزانی ،
چووکەڵە سوارێ من دەچێتە سەفەری ،
گەورە و گرانی دەکاو لە لەحسایە ،
ئەی سوارە رەبی بەدوور بی لە دەردێ لە ئافاتێ لە بەلایە .
لە رەبی عبداللەی حەسۆی وەلەدەی بە رازی.
ئەی سوارە رەبی بەدووربی ،
لە شەقەی دەئاو زەنگیان ،
لە لووزەوی دە سواران ،
لە پڕمەی دە بۆرو بدەوان ،
لە نرکەی دە محەندەکان ،
لە حیلەی دە کە حێلان ،
لە ناڵە نالی دەکەڕە نایە .
سوارە تەڵەبێ دەکەم لە خودای‌گەورە ،
دوایە لە محمدی ئەمین دەکەم تەمەنایە :
ئەو جاریش بە خێرو بە سلامەت ،
وەگەرێی لەوێ سووکە سەفەری پڕهەڵڵایە .
شەرت بێ ئەگەر بێیەوە لەوێ سەفەرێ ،
ئەمن بۆت هەڵدەکێشم زەردێ بەرچێلێ ،
..............................
..............................
سینگی خۆمت بۆ دەکەمەوە گەرمێنی دە گەرمەسێر ،
ناوەڵڵا بە کوێستانی دە باسەفایە .
هەی سوارە مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
دەنگی عارەب و چووکەڵە سوارەکەی من ،
لە مەیدانی دەکوڕە بەبەئیان نایە ،
ئەوە کیژ دەڵێ رەبی سوارێ من بەدووربێ ،
لە دەردان لە بەلایان ،
لە نەفەسی دە چاوپیسی ،
لە گوللەی دە قەرە بینایە .
شەرت بێ ئەگەر بێتەوە لە سەفەرێ ،
سەفەری دەکاولە لەحسایە ،
بۆی هەڵدەگرم کلیلی تۆقان،تەلەسمان ،
گواران ، کرمەکان ، زەبەرجەدان،یاقووتان،
هەتا غەوسەکەی ماڵ لە بەغدایە ،
بۆمان دەکا هیممەتێ لەگەڵ ئەوێ تکایە .
زولفی خۆمی لە بەر دەگیڕم ،
مەمکی خۆمی بۆ دەبەمەوە تکایە ،
..............................
..............................
هەر وەکوو باغچەی کوڕە فەقێیان ،
سێ شەوان بە شەوی دە پاییزێ ،
سێ رۆژان بەرۆژی دە بوهارێ ،
بە نووکی قەلەمێ لێی بکاتەوە متالایە ،
هەی سوارە مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
ئەوە سوارێ من دیارە لە کەناری سواران ،
برین لە بەدەنێ ،
بریندارێ خەڵکی ، بریندارن بەر مبی دوژمنی ،
چووکەڵە سواری من بریندارە بە مەودای دە خەنجەرێ ،

ئەوە بڵێن بە حەکیمان ،عەتاران ،لوقمانان،
قایلمێ دەرمانی کەن ، چ تاقە دەستانی
نەکەنێ ،
ئەوە بۆ خۆم دێم مەڵحەمێکی بۆ دەگرمەوە ،
لە تۆزی دەبسکان ، لە غوماری دە شەدێ ،
لە ژەنگی دەگوارێ ، لە عێلێ لە دارچینێ ،
وردە دەستاوانی پێدەدەم ،
بە ئارەقی قوولکی گەردنێ .
دەیهاوێمەوە سەر برینی چووکەڵە سوارێ ،
ئەوساڵ ساڵە کەی ناسکە ساڵە ،
چووکەڵە سواری من دە چێتەوە سەفەرێکی گران،
ئەمن زۆر دەترسێم ،
ئەوێ برینێ لەبن ڕا بێنێتەوە تەشەنێ .
هەی سوارە.......مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
دەنگی چووکەڵ و چووکەڵە سوارێ من لە
مەیدانی دە کوڕە بەبەئیان نایە .
ئەوە کیژ دەڵێ لەشکرێک هەستاوە لەمن ،
لە کوێ لە چۆلی شامێ ،
بێ ئامانە بێ سامانە دەڵێن زۆرە زۆربەیە .
ئەوە دەڵێ کیژێ چووکەڵە سوارەکەت بریندارە
ئەنگاوە برینی جووت گوللەیە .
ئەمیش دە چوومەوە کن حەکیمان،عەتاران،
لوقمانان ،
دەمکوت وەرنە سەر چووکەڵە سوارەکەی من .
بریندارە کەوتۆ لە جێ شەرگەیە ،
هەی لالۆ بم پێیان دەکوتم :
دەردی بێ مرنێیەتی ،
هەوڵ و تەقەلا ودەرمان کردن ،
گەلێک گەلێک بێفایدەیە .
هەی سوارە مەڕۆ لەمنی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
نەلە چولێ نەلە بەحرێ نەلە بەڕیە ،
دەنگی عارەب و عارەبە سوارەکەی من نایەَ،
ئەوە کیژ دەڵێ جومعەیە و جەماعەتی
دە نەبیە ،
کیژ شەوێ دەنووست خەونێکی دەدیە ،
دەپێی دەکردن جووتێکە کەوشی نوقرە زیڕیە .
لەوی دە کوڕەکی پەنجە ئەسڵی دم چالۆپانیە
بڵێندیە ،
دەستی دەدانەوە جووتێک ئافتاوەی لەوی دە
هەیدەربەگیە .
سەبر سەبر وردە وردە دەڕۆیی بۆ سەرئاوێ .
سوارێک دەهات ورادەبرد ، وەڵاغی بۆرەی گوڵ
گوڵیە ،
دەیکوت سوارێ مەزنی سەدجاران بەمن مەزنی
سینگت لە پۆڵای سەرت لە ئاسنی ،
دەتمرمەوە دەبەر رانی دە رکێفێ ،
دەستی دە دەستە جڵەوێ ،
سمێڵەکە دە خورماییە ،
وەگەر قەف قەف دەکەوتن لە سەر زەردەی دە
لێویە ،
بە نیۆنیشانەت سەفەری .
خەبەری چووکەڵە سوارەکەی منت پێنیە ؟
ئەوە سوار دەڵێ کیژێ بەوەی کەم کە رەبیە .
سوار ئەوەندە زۆرن نازانم نیۆنیشانی **سواری**
تۆ چیە .
هەی سوارە ...مەڕۆ لە منی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
کیژ دەڵێ سوارێ من سواربووە لە جوانوو
ماینێکی شینکەی ئەسحەدبەگیە .
کلک و یاڵ بەنژدیە .
دە پێیدایە جووتێ چەکمەی دە ئیسماعیلیە .
بەسەر شانیەوە کەولێکی دە غەزیە .
ئەگەر لە جوان چاکیێ دەپرسی ئەرسەلانی
رۆمیە .
ئەگەر لە مەردئازایێ دەپرسی ،
لە سێ هزار کەسی پشتەوە کردنی نیە .
ئەگەر لە جوان چاکیی دەپرسی ،
مەنگورو مامش و پیران ،
زەرزا و بۆڵی و دێبوکری و باڵەکەتی ،

زۆسکی و مام سالّ و هەرکی ،
سیدا و مامکۆ و مەندە مەزرە و گرتیلان ،
هەر بەعام سوارێکی وای تێدانیە .
ئەگەر لە نیۆنیشانی سوارێ من دەپرسی ،
شەدەی کورووسینە کەواپاتۆلێ دەمەرقۆ پانیە .
لە سەر کۆشیەتی رمبێکی ئەبوو تۆپی حاجی –
نسیری هەژدە قدفیە .
دەبەرە خۆی چەقاندوە خەنجەرێکی قەرە
خوراسان و لەوی دەسک دە نێرویییە ،
لە جەنگەی هەرایە مەغلوبێدا ،
لە کەناری سواران دێت و دەچییە .
سوار دەڵێ کیژێ ئەو سوارەی ئەتۆ لیێ
دەپرسی ،
دوێنی ئێوارێ محەلی دەچێشت هەنگاوێ .
دەگەڵ پۆلێکی دە کۆمەڵە سواران ،
دەیاندانەوە بەر مەودای دە تفەنگێ. و
گوللەی دە دەرمانییە .
چووکەڵە سوارەکەی تۆ سێ برینی لە قالبییە .
برینی لە هەموان گچکەلەتری ،
کۆترە باریکەی باڵ بە شۆڕابی پێدا دەفڕییە .
رانی دە رکێفی و دەستی دە دەستە جڵەوی ،
سمێلێکە دە خورمایی وەبن بارستایی گڵێ
دەکەوتیە .
هەی سوارە ..... مەڕۆ لەمن بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
ئەوە دەنگی چووکەڵە سوارەکەی من نایە ،
ئەوە سوار دەیکوت رەبی کوێر بم کیژێ
دوێنێ محەلی ئێوارێم دەدی لە سەری مەیدانێ
بە پۆلی عارەبی دە عارەبە رەشکان .
نرکەی دەبۆڕان کوڕەی محەندەکان
پڕمەی کە حێلان ، ورشەی پەڕبە سەران
چرپەی دەمانچان ، تەقەی جان بێزاری ،
هازەی گوللە و بۆنی دەرمانی ،
هەڵیاندەگرت لە سەر خوانی زینیە .
سەریان دەبڕی لە قەڵای قالبییە .
ئەمما ئاخێکی هەڵدەکێشا
دەمگوت هەی سوار ئەم ئاخە چیە و چ نیە ؟
دەیگوت هێندەی هەن هێندەی دیش
بان پیم چ نەبوو .
ئەما لالّ بم ئەلعان چاوم لە گورج ئاورێکی
گراویلکەکەی خۆم نیە .
هەی سوارە مەڕۆ لەمن بەتەنێ .

* * * *

ئەوە کیژ دەیگوت ،
دەبڕۆ سوارە ئەگەر نانت هەیە دۆت نەبی !
ئەگەر دۆت هەیە دینت نەبی !
ئەگەر دینت هەیە ئیمانت نەبی !
دە بڕۆ نەحلەتی خوداتلێ بی !
بەشت لە دنیا و قیامەتێ نەبی !
دەبڕۆ سوارە ئەسپاردەی خودای نەبی !
رمبی دەستت لێ بە دارە مەیت بی !
خەنجەری خۆت غەنیمەت بی !
پشتێندی پشتت لێ بە کفن بی !
ئەسپی بنت لێ بە مەیت هەڵگربی !
دەگەڵ خەبەری بۆ منت هێنا ،
دڵێ گراویلکەی تۆش هەر بەدڵێ من بی !
هەی سوارە .......مەڕۆ لە منی بەتەنێ .

* * * *

هەی نایە وەی نایە دەی نایە ،
دەنگی چووکەڵ و چووکەڵە سوارێ من نایە ،
سوارەی مەزنی سەد جاران بەمن مەزنی .
سینگت لە پۆڵای و سەرت لە ئاسنی ،
ئەو رۆژەم تۆ بە مەردی دەدی ،
کە شیرت هەڵدەکێشا لە کالانێ ،
دەتبڕین کەپۆلوتی عەلی بەگی داسنی ،
هەی سوار ،ئەمن چەندم گاز کردێی مەڕۆ
بەتەنێ .
ئەمن لەبۆت ساز دەکەم ،
لەشکرێ ، تیپێ ، لەگەڵ قۆشەنێ ،
لەشکری ، عبداللەی حەسۆی وەلەدی بەرازی ،
گەلێ گەلێ زۆرن برینانت دەکەن لە بەدەنێ ،
وەگەڕێ چووکەڵە سوارێ وەگەڕێ !

# بووکە بارانە

ئاودێر

چ ئەو کەسانەی بە ئاو و هەوای چڕ و بەندەن و لێرەوار و پێدەشتەکانی کوردەواری گەورە بوون و گووراون و چ ئەو کەسانەی تەنیا بۆ جارێک سەریان لەو مەڵبەندە داوە ، ئەوەی دەزانن کە کوردستان هەرێمێکی سەخت و پڕ لە زەرد و ماهە و بە کورتی زەوی و زارێکی کەمی هەیە و ئەگەر بە وردی لێی بڕوانین نزیک بە ٦٥ لە سەدی زەوی و زاری کوردەواری دێمەکارە و بەشێکی کەمیان ئاویژەن . لە لایەکی دیکەوە بە هۆی لەوەڕگەی زەنوێر و هەوارگەی خۆش و باسەفا باشترین جێگایە بۆ ئاژەڵداری .

جا بەو هۆیەوە کشت و کاڵ لەو ناوچەدا بەو جۆرەی شیاوە پەرەی نەگرتووە . هەڵبەت پەرەنەگرتن بە هەر دووک مانا ، چ لەوبارەوە کە ئاژەڵداری خۆشەویستتر و پڕداهاتترە لە کشت و کاڵ ، چ لەو بارەوە کە بڵێین ئەو جۆرەی شیاوە کەلک لە زەوی وەرناگیرێ و زەوییەک کە ساڵێک حاسڵی لێ وەرگیرا بۆ ساڵی داهاتوو هەر شێوەرد دەبێ و ناچێندرێ یان لانی کەم ئەو حاسڵەی لێ ناچێندرێ . جا با لە باسەکە دوور نەکەوینەوە . زەوی دێمەکار بە دەستی وەرزێر پاراو ناکرێ و بە قەولی فارس دەڵێ ئاهی نەگرفتەیە . بەڵام ئەوەی جێگای باسە ئەوەیە کە ئەگەر ساڵێکی خودا و راستان باران زۆر باری ئەوە بار بارە . دەنا ئەگەر باران بەوەخت و بەجێ نەبارێ کار لە کار دەترازێ و بەرهەمی ئەوێ ساڵێ کۆ ناکرێتەوە . جا بۆوەی باران ببارێ لەکاتی وشکە ساڵێدا رەسمێک هەیە بە نێوی ( بووکە بارانە ) ئەویش لەبەر خاتری ئەو مەبەستەیە کە خەڵکی کورد قات و قڕییان زۆر دیوە و بە تایبەت ئەگەر ساڵێک وابێ و گەنم زۆر نەبێ پێیان وایە قاتی یە و ئۆخژنیان بە هیچ حاسڵێکی دیکە ناکەوێتە دڵ . جابۆیە بووکێک ساز دەکەن و خەڵکی ئاوایی یەکانی مەڵبەندەکە بە دوای دادەڕۆن و هاوار دەکەن :

**بووکی مە بارانی دەوێ**
**ئاوی نێو دەغڵانی دەوێ**
**هێلکەی باڕۆکانی دەوێ**
**دەسرەی کچۆڵانی دەوێ**

زۆر شیعری فۆلکلۆری دیکەشی هەیە بەڵام چاوپۆشی لێدەکەین و تەنیا باس لەوەندە دەکەین کە بووکە بارانە چیە ؟ ولە کوێوە سەرچاوە دەگرێ ؟

ئەگەر بە چاوی لێکۆڵینەوە بڕوانینە مێژوو مەبەستێکی بەرچاو و ئاشکرا لە میر و حاکماندا دەبینین، وەک ئەوە کە تووڕە دەبن و هەر کە تووڕەش بوون نیزومێ ناپارێزن کۆڵکەی دار و دەون وێگرا دەسووتێنن . جا بۆ وەی خەڵکەکە ئەو میرانە ئاشت کەنەوە دیارییان بۆ بردوون جاچ لەکیژۆڵەیەکی جوان و لەبار و تازە بووکێک چاتر دەتوانێ

پاشماوەی مینا

جەماعەت چۆتە مزگەوت . دایکی سفرەکەی لە سووچی وەتاغێ راخستبوو، بۆ وەی ئەگەر مێردەکەی لە نوێژ هاتەوە مەحتەل نەبێ .نان و چای بخوا و بچێتە کارێ . دایکی دیت دەهات وەدەرکەوێ ئەویش شیوی مالانی دەکرد . کە دیتی مینا لەبەر دەرکەی وەتاغ چاوەڕێیە دایکیشی گەڕاوە لای.رووی تێکرد وگوتی: "مینا بەم بەیانە بۆ لە خەو هەستاوی ؟ لەو بەردەکەی چ دەکەی ؟"

مینای هەناسە سارد رووی لە دایکی کرد و گوتی :

"دایە گیان خەوم نەدەهات ئەدی تۆ چ دەکەی ؟ بۆ کوێ دەچی ؟"

ـ رۆڵە منیش هیندێکم شیوی ماڵە میرزا بارامی ماوە .بۆیە وادەچم نیوەڕۆیە زوو بگەرێمەوە . ئەورۆ بەتەنێ لە ماڵێ وەڕەز دەبی.

"دایە گیان دەکرێ تکایەکت لێ بکەم ؟"

ئەوەندەی گوت بەڵام نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا هەر دوو دەستی بە دەم و چاوی گرت و لە قولپەی گریانی دا . دایکی دەستێکی بە سەریدا هێنا و گوتی :

"رۆڵە درەنگمە چت دەوێ پێم بڵێ مینا گیان "

مینا ئەو جار هێندێک ئەهوەن بۆوە و گوتی :

" دایە گیان تۆ خودا ئەگەر دەچی بۆ ماڵە میرزا ـ بارامی سابوونەکەی لەبەر پشتێندت نێ ئەگەر کارت پێ بوو دەری بێنە دەنا با هەر لەوێدا بێ .با قەلەڕەشە نەیبا ، دەنا ئەتۆش دەردەکەن."

ـ باشە دایک بە قوربانت بێ. تۆ ئاگات لەبابت بێ و نان و چای بدەیە ."

* * *

بەڵێ ئەوەندە وت و وێژە دوامین دیداری ئەو رۆژەی دایک و مینا بوو ، دایک وەدەر کەوت .لە رێگا بیری لە وتەی ئەو منداڵە کردەوە. تازە زانی کە سابوونی ماڵی زارا خاتوون چی بەسەر هاتووە .

* * *

---

میر ئاشت کاتەوە و ئاوری غەزەب و تووڕەیی میر دابمرکێنێ . ئەو باوەش لە دەورانی ئاناهیتاوە ماوەتەوە . هەڵبەت بە بڕوای من دەبێ وابێ ، دەنا لە هیچ کوێ نەمبیستووە بەڵگەشم ئەوەیە کە لەو سەردەمەدا هەرشتێک خودای خۆی بووە وەک خودای چاکە ، خودای باران ، خودای شەڕ ، خودای ئەوین ، و ... ئێستاش شوێنەواری ئەومەبەستە لە ئاوایی-یەکانی خۆماندا بەدی دەکرێ وەک خێوی ئا و خێوی دارستان ، و... جا هەر لەبەر ئەوەکە دەزانن خودای باران تووڕە بووە و قەستی لە نێو بردنی ئەو دەستەیەی هەیە بۆ وەی ئاشتی کەنەوە بووکێکیان ساز کردووە لە شاریان بردۆتە دەر و بەرەو پیری حاکمی بارانیان بردووە هەتا دڵی وەڕەحم بێ و باران ببارێنێ .

جا ئەو مەسەلە لە دوای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام گۆڕاوە و بۆتە نوێژە بارانە کە هەڵبەت هەر لەو بووکە بارانە سەرچاوە دەگرێ. بۆ نوێژە بارانە دەستەیەک لە پیاوە چاکەکان و ئەوانەی موسڵمان و لە خودا ترسن وەپێش خەڵک دەکەون و لە دێ وەدەر دەکەون و لە قەراغ دێ لە نێو پارچە زەوییەکدا نوێژ دادەبەستن و دەست دەکەن بە نوێژ کردن . بەو کارە سوجدە دەبەنە بەر خودای گەورە و لەبەری دەپاڕێنەوە ،تا ئاوری قەهر و غەزەبی دابمرکێ و دەرگای رەحمەتی بکاتەوە و باران ببارێنێ هەتا خەڵک تووشی وشکە ساڵی نەیەن ، جا بە دوای وەیدا نوێژە بارانە هاتۆتە کایە بووکە بارانە بۆتە کایەی منداڵان و هەروا بە شێوەیەکی کورت کراوە ئێستاش لە زۆر جێگای کوردستاندا وەک خۆی ماوەتەوە .

نیە لە مومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بە غەیری خاجەیی دیوانی ( عالم الاسما )

بە حەول و یاریدەی خودا گۆواری سروە هاتە دەر و بە هەموو شار و مەلبەندەکانی کوردستان و شوێنەکانی تر دا بڵاو بۆوە . برسی و توونی زۆر دەرگای کوتا . سەری لەزۆر ماڵان دا . ماڵم قەبرە ! میوانداریشی لێکرا .سەرەڕای قەدر و ڕێزێکی زۆر ڕەخنەشی لێ گیرا .

لە پێشدا پڕ بە دڵ سوپاسی ئەوانە دەکەین کە ڕەخنەیان گرت و پێشنیاریان بۆ ناردین . بە بڕوای دەستەی نووسەرانی سروە ئەوەش چەشنە پێشوازییەکە و نیشاندەری ئەو پەڕی هەستی پاک و خاوێن و دڵسۆزانەی خەڵکی موسڵمان و ئەدەبدۆستی کوردستانە .دەیانەوێ ئەم گۆوارە لەو پەڕی جوانی و بێعەیبیدا دەربچێ ، چون بە ئی خۆیانی دەزانن .

لە کوتاییدا دووپاتی دەکەینەوە کە بە باوەشێکی ئاوەڵاوە لە ڕەخنەی بەجێی ئێوە پێشوازی دەکەین ، لەم بەشەی گۆوارەکەماندا هێندێک لەو ڕەخنانەی کە دەتوانین بە کەلک وەرگرتن لەوان کەم و کووڕی و هەڵەکان چارە سەربکەین ، چاپ دەکەین. ئومێدەوارین نووسەرانی سروەش بە تایبەتی نووسەرانی لاو لەمە بەدوا کەلکی لێ وەربگرن .

بەو هیوایەی خوێنەرانی سروە ڕەخنە و پێشنیاری خۆیانمان بۆ بەڕێ بکەن تا هەم ئێمە کەم و کووڕی کارەکەمان بناسین و هەم گۆوارەکەش پڕ نێوەرۆکتر بێ.

# ڕەخنە و ...

کاک سەید ئەحمەدی سەعدەیی

☆مەلا " صادق "ی زەندی کوڕی مەلا برایمە نەک مەلا ـ ڕەسووڵ ، بەڵکوو برازای مەلا ڕەسووڵە .

☆لە ڕۆژانی دەسەڵاتداری ئاغاکاندا هەر کەس سەبارەت بە دەسەڵاتداری ئاغا و نوشتوو و گشتەک و بیر و باوەڕی شێخایەتی دژایەتی دەر بڕیبا بە توودە و کمونیست و کەڵبەش دەناسێندرا .

☆.......... بە داخم ئەو شتانە لە هەوەڵین ژمارەی سروەدا نووسراون ....

تاران : کاک ج ـ ئاشتی

☆ ئەگەر "صاحبقران" قارەمان بوون،چی بەسەر شاعیر بوونی " سالم"داوە ؟

☆ تێ هەڵکێشی "سالم"لەسەر شیعری "حافظ"ی شیرازی... بە بڕوای من... ناتوانێ سالم بناسێنێ. چونکە شاعیر لەو جۆرە کارانەدا تەواو ئازاد نیە . لە چوار چێوەی قالب و وەزن و فکری شاعیری پێشوودا دەست و پێی گیراوە ....

مامۆستا مەلا ڕەشیدی قەرەنی ـ زادە

☆مەلا ڕەسووڵی صادقی خۆی خاوەن شیعرە و هەر نووسەرێکیش بیر و باوەڕ و ناسکترین هەستی خۆی لە شیعرەکانیدا دەردەبڕێ، پەس داوەری لەسەر عەقیدە و بیر و باوەڕی یەک زانا ، نووسەر، شاعیری ڕابردوو، دەبێ بە یارمەتی نووسراوەکانی ئەنجام بدرێ.

تەحقیقی

توێژینەوە : سید محمد صمدی

کەلبەش چ بوون

کاک هاوار :

☆ مەقالەکە پڕ بوو لە وشەی عەرەبی،نووسەر بیر و ڕای خوی دەخالەت دابوو کەچی لە مەقالەی تەحقیقیدا نووسەر دەبێ بێلایەن بێ .

## پێشیار ٧

**مەهاباد :مامۆستا مەلا رەشیدی قەرەنی زادە**

☆ئەو شیعرە کە دەڵێ :

**( کە شوعلەی تەلعەتی یوسف تلووعی کرد بەچی زانیم )** رەنگە دروستەکەی (ئەمن زانیم) بێ .

☆ شیعری دوایەش :

**(.کەلامت حافظا دڵ سەنجە بو سالم وەها چاکە )**

دڵ سەنجە یانی چی ؟ رەنگە ئەوەش واژەیەکیتر لە جێگای ( سەنجە ) هەبوو بێ ...

**بۆکان : مامۆستا حەقیقی**

☆ لە شیعرەکانی "سالم"دا ئەم وشانە بە هەڵە نووسراون لە میسراعی :

**( لەبن خاری موغیلان وەسڵ ئەگەر بێ شارەزوور ناکەم )دا** ( شارەزوور ) نیە و (ئارەزوو) دروستە .

لە میسراعی :

**( دووسەد جار گەر بە گوێی خۆم حەرفی سادەت بشنەوەم شادم )** دا ( حەرفی سادەت ) نیە و ( حەرفی ساردت)دروستە

لە میسراعی :

**( کە حوسنی تەلعەتی یوسف تلووعی کرد بە چی زانیم )** دا ( بەچی ) نیە و ( لەچەه ) دروستە .

### رەخنە لەسەر بەشەکانی دیکەی سروە

**مەهاباد :کاک محەممەدی کەریمی**

☆نێوەرۆکی گۆوارەکە زۆرە ... ئەگەر سەرنجێکی گۆوارەکانی دیکەتان دابێ ، دەزانن کە بەرچاوترین کەم و کووڕی گۆواری سروە کەم بوونی وێنەیە ........ ئەمەش عەیبێکی گەورەیە .... ئەگەر دەگونجێ لە عەکسی رەنگی کەلک وەربگرن .....

**تەورێز : کاک قادری فەتتاحی قازی**

☆پێم وایە خەتەکەی برێک وردە ، ئەگەر هێندێک درشت تر بایە باشتر بوو .

**تاران : کاک سیدجلال الدین نظامی**

☆لەهەر کەسێک تەنیا نووسراوە و بەرهەمێک چاپ بکرێ و ئەم کارە شێوەی هەر گۆوارێکی ناودارە .

☆شێوەی کوردی شیمال ( بادینی ) زۆرتر بکرێ.

**کاک دارا ـ م**

گرینگی بە هونەری تەرجەمەش بدرێ ، جا چیرۆک بێ یان شیعر یان هەر باس و بەرهەمێکی ئەدەبی بە سوود بێ .

**بۆکان : کاک ئەحمەدی مەجدی**

☆پێشنیاری ئەوەم هەیە کە لاپەڕێک لە گۆوارەکەدا بە ناوی ( لەگەڵ شیعری شاعیرانی لاو ) بکرێتەوە..

**سنە : مامۆستا سەید هاشمی هیدایەتی**

☆ئیسلام دینی حەرەکەت . دینی حکوومەت .... ،دینی برایەتی و بەربەرەکانێ لەگەڵ زولم و دیفاع لە بەشخوراوانە ، کە وابێ ئیدەئۆلۆژی ئیسلامی گرینگتر لەوەیە کە لە چەند دێڕ باسی ئەخلاقیدا کورت بکرێتەوە .

★جگە لەم خاڵانەش رەخنەی دیکەمان زۆر گەیشتۆتە دەست ، کە زوربەیان رێ نیشاندەر بوون و کەلکمان لێ وەرگرتوون. لەبەر کەمی جێگا تەنیا بە ناو بردنیان وازدێنین.

**کاک مستەفا دادار ـ کاک حامیدی شافیعی ـ کاک محەممەدی وەجدی قزلجی ـ کاک خالید پەشێو ـ کاک هەمزە خوشکە ئامینەی عەزیزی ـ مامۆستا مەلا عومەری چەختی ـ کاک سەید کازمی ژار آبادی ـ مامۆستا مەلا عبدا .. لێقەوماو کاک عومەری فاڕووقی ـ کاک حەسەنی شەریفی ـ کاک مستەفا ئیلخانی زادە ـ کاک ئەحمەدی مەجدی ـ کاک کلیما ...توحدی ـ کاک سەلاحی عەرەبی ـ کاک ئیبراهیمی ئەفخەمی ـ کاک فەرهادی قازی ـ کاک حەسەنی سوبحانی ـ کاک کەریمی رەسووڵپوور ـ کاک مەسعوودی پاکنەهاد ـ کاک رەحمانی حاجی ـ کاک عادڵ .**

**زۆر سوپاسیان دەکەین.**

# سەرداری موسڵمانی کورد صلاح الدینی ئەیووبی

فارووقی دەلخوێسرەوی

## بەشی دووەم

سەردەمی دەسەڵاتداری

صلاح الدین :

لە پاشکۆچی دوایی شێرکۆ بە فەرمانی خەلیفە، صلاحالدین لە جێگای دانیشت و ناز ناوی" مەلیک ناسر "یشی وەرگرت .

مەلیک ناسر صلاح الدین بۆ ئەوەی بتوانێ باشتر کار و باری وەزارەت هەڵسوورێنێ بە پێویستی زانی باوک و خزم و کەسی خۆی بۆ میسر بانگ بکا و یارمەتی یان لێ بخوازێ . بە گەیشتنی نامەی صلاح الدین لە مانگی رەجەبی ساڵی ٥٦٥ ی.ک" ١١٦٩ ی.ز" دا نجم الدین ئەییووب گەیشتە میسر و لە لایەن خەلیفە عازیدەوە پێشوازیەکی گەرمی لێ کرا . مەلیک ناسر دوای بەخێر هێنانی باوکی زۆری لەبەر پاڕایەوە کە وەزارەتی میسر بە دەستەوە بگرێ و کار و باری ئەو وڵاتە ئیدارەبکا .
بەڵام نجم الدین قەبووڵی نەکرد و گوتی ئەگەر تۆ لیاقەتت نەبوایە خوا ئەمەی نەدەدایتێ .

مەلیک ناسر کەوتە رێک و پێک کردنی کار و باری وڵات و پەلاماری خاچپەرستەکانی بۆ سەر "دمیات" و "عەقەبە" کە رێگای هات و چۆی حەجاجی

لە سەوزیی چیای سەربەرزی هەڵگورد
ئەوە هەورم لە ژێر پێیدا بە دیل کرد
تەماشای دیمەنی سەوزی وڵاتم
منی سەرسام و شاگەشکە و خەنی کرد
١٣٦٣
ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

میسر بوو تێک شکاند .هەروەها
دەسیسەی خایانەی" موئتمن ـ
الخلافە"ی بەرپەرچ داوە، کە
بە رێککەوتن دەگەڵ
خاچپەرستەکان و بە یارمەتی
ئەوان دەیویست دەسەڵاتی میسر
بە دەستەوە بگرێ .

لە ساڵی ٥٦٧ ی.ک "١١٧١ ی
ز " دا خەلیفە عازید کۆچی
دوایی کرد و حکوومەتی میسر
بەتەواوی کەوتە دەست
مەلیک ناسر، و لە هەمان
کاتدا سوپاسالاری سولتان
نورالدینیشی هەر بە ئەستۆوە
بوو. ئینسانی خراپ وبەدخواز
لە لای سولتان نورالدین بۆیان
تێدە چاند کە صلاح الدین خۆی
بە سولتان دەزانێ و لە ژێر
حوکمی تۆدا نەماوە .سولتان
لێبڕا کە بەرەو میسر بڕوا و
یەکێکیتر لە جێگای صلاح الدین
دابنێ .

صلاح الدین کە بەمەی زانی
کۆڕێکی لە باوک، خاڵ وخزم
و کەسی خۆی پێک هێنا و
راوێژی دەگەڵ کردن .
تقی الدین کە برازای
صلاح الدین بوو پێشنیاری کرد
کە خۆیان بۆ شەڕ لەگەڵ
نورالدین ئامادە بکەن. بەڵام
نجم الدین ئەییووب بە گژیدا
چوو و رای گەیاند کە ئێمە
هەموومان خۆ بە نۆکەر و گوێ
لە مستی سولتان نورالدین
دەزانین،و لە پاش ئامۆژگاری
یەکی زۆری صلاح الدین پێی
گوت کە ئەگەر لە قسەی
باوکی خۆت دەرناچی، دەبێ
نامەیەک بۆ سولتان بنووسی
و دڵنیای بکەی کە خۆت لێ
نەگۆڕاوە و هەروەک جاران
نۆکەر و کۆیلەی بارەگای ئەو
خانەدانەی . صلاح الدین بەو
جۆرەی کە باوکی پێی گوتبوو
نامەی نووسی و بەڕێی کرد .

سولتان نورالدین بە
دیتنی نامەی صلاح الدین
شادمان بوو و دڵی
دامرکایەوە. لە ساڵی ٥٦٨ ی.
کۆچی " ١١٧٢ ی.ز" دا رۆژێک
نجم الدین ئەییووب لەسەر
ئەسپ هەڵدێرا و لە دوای
چەند رۆژێک وەفاتی کرد.
ساڵێک دواتریش نورالدین
محمود کۆچی دوایی کرد و
بە مردنی وی بە یەکجاری
و بەبێ هیچ کۆسپ و بەرگرێک
دەسەڵاتی وڵاتی بەرینی ئیسلامی
بۆ صلاح الدین بەجێ ما .

**صلاح الدین شەڕ دەگەڵ
خاچپەرستان و پاک کردنەوەی
وڵاتە ئیسلامییەکان لە داگیر
کەرانی بێگانەی بە ئەرکێکی
دینی خۆی دەزانی و بۆگەیشتن
بەم ئامانجە هەوڵی دەدا
یەکگرتوویی یەکی بەهێز لە
وڵاتانی ئیسلامی پێک بێنێ ..**

لەو سەرو بەندەدا جگەلە
میسر کە دەسەڵاتی بە دەست
حاکمێکی وەک صلاح الدینەوە
بوو هیچ حکوومەتێکی دیکە
هێز و دەسەڵاتی ئەوتۆی نەبوو
کە حیسابی لەسەر بکرێ . لە
پاش وەفاتی سولتان نورالدین
کوڕە منداڵەکەی"مەلیک سالح"
ببووە جێنشینی،ئەمیر
سیف الدین حاکمی مووسڵ و
سولتانی سەلجووقی رۆمیش
هێزێکی بەرچاویان نەبوو.
صلاح الدین بۆ ئەوەی خەڵکی
شامی لە دژی خۆی هان
نەدابێ و یەکەتی وڵاتانی
ئیسلامی پاراستبێ بە ناردنی
نامە بۆ مەلیک سالح خۆی بە
پەیڕەو و گوێڕایەڵی مەلیک
دادەنا و دەستووریشی دابوو
لە خوتبەکاندا ناوی
بخوێندرێتەوە و سکەش بەناوی
ئەوەوە لێ بدرێ بەڵام لە پاش
ئەوەی کە بە دەهۆی"کومەشتە ـ
کین "حاکمی حەلەب، کە بۆ
دابین کردنی دەسەڵاتی خۆی
دەگەڵ حاکمی قودس رێک
کەوتبوو، مەلیک سالح بانگ
کرایە حەلەب و دەسەڵاتی
سووریا کەوتە دەست
کومەشتەکینەوە . بە داخوازی
گەورە پیاوانی دیمەشق مەلیک
ناسر صلاح الدین دوای ئاگادار
کردنی خەلیفەی بەغدا بەرەو
سووریا رۆیشت و ئەویشی خستە
ژێر قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی
خۆیەوە. دوا بە دوای ئەم
سەرکەوتنە کە ساڵی ٥٧٠ ی.ک
" ١١٧٤ ی.ز " و بە دوای
چەندین شەڕی سووک و قورسدا
وەدەستی هێنابوو لە لایەن
خەلیفەی عەبباسییەوە بوو
بە فەرمانڕەوا و سولتانی
میسر . لەوە بە دواش لە
خوتبەکاندا ناوی سولتان

صلاح الـدیـن دەخوێندرایەوە و
سکەش بە ناویەوە لێ دەدرا .

پاش گەڕانەوەی سولتان
صلاح الـدیـن بۆ میسـر
خاچپەرستەکان پەلاماریان
بردەوە سەر شام و بەعلبەک
تالان و کوشتارێکی زۆریان کرد
و ژمارەیەکی زۆر لە
موسلمانانیان بە دیل گرت .
سولتان بە بیستنی ئەم
هەواڵە بەرەو فەلەستین
گەڕایەوە و لە "ڕەملە"
شەڕێکی توندی دەگەڵ
کردن کە تێدا سەر نەکەوت .
[٥٧٣ ی.ک = "١١٧٧ ی.ز"]. هەر
چۆنێک بوو خۆی دەرباز
کرد و گەیشتەوە میسر و
ئەمجار بە لەشکرێکی
تەیارەوە هاتەوە سەر
خاچپەرستەکان و تێکی شکاندن

خاچپەرستەکان دوای ئەم
تێک شکانە ترسیان لێ نیشت و
لە نزیکی "بیت یعقوب"
دا قەڵایەکی مەحکەمیان ساز
کرد و دوای ساز کردنی
قەڵاکە لەشکریان ناردە
سووریا . سولتان صلاح الدین
بۆ بەرنگاربوونی ئەم
لەشکرە" ئەمیر فەڕڕوخشا"
ی برازای بە لەشکرێکەوە
ناردە بەرانبەریان و خۆیشی
چووە سەر قەڵای یەعقووب . لە
شەڕێکی زۆر قورسدا
خاچپەرستەکان بە توندی
تێک شکان، شپرزە بوون و
زۆریان بە دیل گیران
[" ٢ ی موحەررەمی ٧٧٥ ی ک. =
١١٧٩ ی.ز "]. دوای ئەم تێک
شکانە خاچپەرستەکان داوای
مۆرکردنی پەیمانێکی
دوو ساڵەی ئاشتییان کرد و
شەڕ برایەوە .

سولتان صلاح الدین گەڕاوە
میسر و دەستی کردەوە بە ڕێک
و پێک کردنی کار و باری نێو
خۆی وڵات و کردنەوەی مەدرەسە
و ڕێگا و بان و ....

هەر لەم ڕۆژانەدا ئەمیر
سیف الدین حاکمی مووسڵ و
مەلیک ساڵح حاکمی حەلەب
مردن و دەسەڵاتداری حەلەب
و بەشێکی زۆر لە وڵاتی مووسل
بە پێی وەسیەتی حاکمانی
پێشوویان بە "عزالدین مەسعوود"
ی ئامۆزای مەلیک ساڵح بڕا ،
سولتان صلاح الدین لەم
کارەساتە نیگەران بوو بەڵام
لەبەر ئەوەی قەتی پێ خۆش
نەبوو عەهد و پەیمان بشکێنێ
خۆی تێنەگەیاند .تاکوو
خەبەری بیست "عزالدین "بۆ
بەربەرەکانێ دژ بە سولتان
دەگەڵ خاچپەرستەکان ڕێک
کەوتووە ، ئەودەم سولتان
صلاح الدین لەشکری بردە سەر
شام و لە مانگی سەفەری ساڵی
٥٧٨ ی.ک دا گەیشتە شام و
لەوێڕا بەرەبەرە پەلاماری
بردە سەر مووسڵ و شنگار
و قەڵای ئامێد " دیاربەکر"و
گرتنی . دوایەش لەشکری بردە
سەر حەلەب و زۆری نەمابوو
لەو شەڕەدا بەتەواوی
سەر کەوێ کە حاکمی حەلەب
پێشنیاری کرد سولتان
صلاح الدین ناوچەی شنگاری لە
لە جێگای حەلەب بداتێ و
سولتان قەبوولی کرد . **بەم
جۆرە لە مانگی سەفەری ساڵی
( ٥٧٩ ی.ک "١٨٣ ی . ز " دا
حەلەبی کەوتە دەست و ئەمەش
بوو بە هۆی ناوبانگ
پەیدا کردنی زیاتری
سولتان و وڵاتی بەرینی
ئیسلامی لە جەزیرەوە تا
ڕەملە و لەوێ را تا ترابلۆس
و یەمەن هاتە ژێر دەسەڵاتی
سولتان صلاح الدینەوە .**

**بە داخوازی گەورە پیاوانی دیمەشق مەلیک ناسر صلاح ـ
الدین دوای ئاگادار کردنی خەلیفەی بەغدا بەرەو سووریا
ڕۆیشت و ئەوێشی خستە ژێر قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی
خۆیەوە . دوا بە دوای ئەم سەرکەوتنە کە ساڵی ٥٧٠ ی.ک
" ١١٧٤ ی.ز " و بە دوای چەندین شەڕی سووک و قورسدا
وەدەستی هێنا بوو لە لایەن خەلیفەی عەبباسییەوە بوو بە
فەرمانڕەوا و سولتانی میسر . لەوە بە دواش لە
خوتبەکاندا ناوی سولتان صلاح الدین دەخوێندرایەوە و
سکەش بە ناویەوە لێ دەدرا .**

**( درێژەی هەیە )**

تێبینی : لە پڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی رێنووسی کوردی بە پێی رێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە رەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی(٧) دانەنراوە.واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی( شڕ، گوڵ،زۆر،شێرو..)ی تێدا بێ بە شکڵی(شر،گول،زور،شیرو..)دەنووسرێ.

| | ١٥ | ١٤ | ١٣ | ١٢ | ١١ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | | | | | | | | | | | | | | ■ | |

١ – شاعیرێکی مەزنی کورد کە ئەوینی دوو دڵداری کوردی کردۆتە شیعر – بۆشنیە ٢ – مەڕدار بەهاران خۆ بۆ ئەوێ دەکوتن – یارمەتی و کایە ٣ – دەستی عەرەب – هەوەڵین ژمارەی جووت. زیز و زویر ٤ – شاعیرێک کە ئەوینی پاکی شەم سەوداسەری کردبوو–هان ٥ – فارس پێی خالیسە – دەم – کات – کەوتنەکەی کاری مریشکە ٦ – گێژ و کاس– عەدەدێکە – شیو و خڕ – هەم یاری پێ دەکرێ هەم شەڕ٧– بە پەیڕەوانی مەلا سادقی زەندیان دەگوت – هەوێنی پەنیریان لێ ساز دەکرد. ٨ – دەنگی گورگ – رەشکەی گەورە ٩ – بە فارسی ئێمەین – لەزەتی دنیایە بەلام کە هێرشی بۆ هێنای فرێی بدە. ١٠ – چیایەکی بەرز و خۆشە لە نزیک سنە – سەرچاوەی چۆمی قزلّ وەزان ١١– شوێنەوار و ئەسەر – زێدی شا نعمتا...ی وەلی– ١٢ – ئامرازی بانگ کردن – خوودای جوانی یوونانی قەدیم – یا قەبرە یا هێز. ١٣ – قازی کێوی و ئەندامی هەناسە کێشانە و ژمارەیەکە – دنە – دەنگی کۆتر– ئەگەر کردنەوەی لەگەڵ بێ پشکنینەوەیە و شەرح کردن. ١٤ – دڵۆپێکە و لەبەر دەکرێ – تامی کوللێرە خۆش دەکا. ١٥ – شاعیر بە گوڵی جێ بەرز و سەرنەوێ دەزانێ و کێوێکە لە سەقز– دەریایەکە لە شمالی ئورووپا – سەرەوبنی کە و لە چاوی کێشە –

١ – رەنگی بێرەنگی – جێگای نەرمان و بژوێنی چیا – مل، گەردن. ٢ – بازی مێ – خۆی تێدا دەبینێ. ٣ – شاعیرێکی بە ناوبانگی موکریان – شاعیری بە ناوبانگی گۆران – بزر. ٤ – بنۆس و سەبەب – دەرگای تەنەکەی دووکانان – هۆڵی سەراوبن – ٥ – ئێسکێکی ناو لەشی ئینسان – ئێوە بە زمانی بێگانە – بڵاو نیە و شارێکە. ٦ – نێوان– لەسەر دیوار سازیان دەکرد. ٧ – کەرەواڵە – دەرگای گەورەی حەوشە. ٨ – کەس ئی خۆی پێ ترش نیە – گێل نیە – دیار نیە – ٩ – کێشکچی تورکی – هان بوو نێوکی کەوت – هادی بەرقەی کەوشی بارگین. ١٠ – خۆڵی لەگەڵ کەی جوانترە – نیوەی بانە – دڕدۆنگی – بە قەندی دەخورێتەوە – دەبێ بە دەمی مەڕی خۆش بێ. ١١ – شوێنەوارێکی کۆنە لە کوێستانی ماین بلاخ. ١٢ – لەتی تەواو – خودا ئی بزنی کۆڵە لە شاخدار دەستێنێتەوە – چاڵ بە لەهجەی هەورامی – بیر ١٣. – چاردە سانت لە گەز کەمترە – چارەی تەرازووی لاسەنگ ١٤. – لەگەڵ چۆخە لەبەری کە – ئێمە بە زمانی بێگانە – کەوڵەکەی گرانبایییە. ١٥ – نێو ئاخن – دەسرۆکەیەکی بە ناوبانگە –

## پڕ کراوەی جەدوەلی( ١ )

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | خ | ا | چ | پ | ە | ر | س | ت | ا | ن | ■ | ن | م | ە | د |
| ٢ | ا | ■ | ل | ی | ■ | ی | ا | ر | ■ | ھ | ر | ■ | ە | ا | ل |
| ٣ | ل | ە | ە | ا | س | ا | ■ | م | ە | م | و | ز | ی | ن | ■ |
| ٤ | ی | س | ■ | د | ی | ک | ت | ە | ■ | س | م | ی | ت | ■ | خ |
| ٥ | د | ■ | ت | ە | ل | ا | ر | ■ | م | ا | ی | و | ■ | ل | ا |
| ٦ | ی | ا | و | ■ | و | ر | ی | ن | ە | ■ | ل | ی | ز | ا | ن |
| ٧ | ب | ا | ■ | ن | ا | ی | ■ | و | ■ | ب | ■ | ە | ی | ژ | ا |
| ٨ | ن | ■ | و | ا | ن | ■ | ب | ■ | د | ە | م | ■ | ر | ە | ی |
| ٩ | ی | خ | ■ | ل | ا | س | ە | ڕ | و | ر | ■ | ب | ن | ■ | ت |
| ١٠ | د | ر | م | ی | ■ | ر | ی | ا | ■ | ق | س | ن | ■ | ج | د |
| ١١ | ە | ا | ر | ■ | د | و | ت | ■ | ە | ■ | ر | ە | ج | ە | ب |
| ١٢ | ل | پ | ا | و | ل | پ | ■ | ب | ە | ش | ■ | ر | ە | ز | ا |
| ١٣ | ی | ■ | د | ا | و | ی | ن | ش | ر | ■ | ح | ە | ر | ی | د |
| ١٤ | د | ر | ■ | ک | پ | ■ | ق | ی | ا | م | ە | ت | ■ | ر | ی |
| ١٥ | ■ | ک | د | س | ە | ی | ە | ە | ج | ی | ج | ■ | ش | ە | ■ |

دەتوانن پڕکراوەی ئەم جەدوەلەمان بۆ بەرێ بکەن. لە نێو ئەوانەیدا کە دروستیان پڕ کردبێتەوە بە پێی قورعە یەک کەس بە بەرندە دەناسرێ. جایزەی بەرندەی جەدوەل بریتیە لە ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروە. دەبێ پڕکراوەی جەدوەلەکەمان تا کۆتایی مانگی رەزبەر بگاتە دەست.

هەبوو ، نەبوو ، کابرایەک بوو ، دوو ژنی بوو . ئەم کابرایە زۆر ترسەنۆک و بێ دەستەڵات بوو ، بە تایبەت شەوانە زۆر دەترسا ، ئەگەر شەوێ هاتبا و کاری سەرئاوی بوایە دەبوو ژنێکیان لەگەڵی بچێ و لەبەر دەرگا راوەستێ هەتا تەواو دەبێ . ئیدی باسی رێویت لەلا کردبایە ، حەفتا رۆحی پێبا یەکی پێ نەدەما . خەڵک ناویان نابوو پاڵەوان فس فس .

ئەم دوو ژنەی کابرا لە دەستی وەزالە هاتبوون . شەو و رۆژ ئاراو قارا یان لێ هەڵگیرا بوو ، بە دووی چارەیەکدا دەگەڕان ژنە گەورەکەی دەیگوت با دەری کەین رێگای ماڵێی نەدەین. بە کورتی هەموو دەم و سەعاتان راوێژ بوو .

شەوێک لە شەوان ، لەسەر رێ و رەسمی جاران، کابرا ژنەکەی لە خەو هەستاند هەتا لەگەڵی بچێتە دەر. هەر بۆیە لێی نزیک بۆوە و گوتی :

ـ زایفە ! زایفە ! هەستە بمبە دەرێ

ژنە وەجواب هات و لە وڵامدا گوتی :

ـ هەی خوا بتکوژێ زەلام ... تۆ خوا بە تۆش دەڵێن پیاو .

پیاوەکە کە زۆر دەترسا گوتی :

ـ ئاخر زایفە گیان بە قوربانت بم بەڵکوو من چوومە دەر و رێوی هات جا ئەو دەم منی چارەڕەش چ بکەم ؟

ژنە هەستا لەگەڵی چوو و لە باتی ئەمە کە لە دەرکی حەوشێ راوەستێ بە غار هاتەوە ماڵێ و دەرکەی داخست کابرا کە ویستی بێتەوە ژوور هەرچی نەڕاندی وقیژاندی و پاڕاوە و لالاوە دەرکەیان لێ نەکردەوە . ئەوجار کە دیتی کاری کراوە گوتی :

ـ ئێستا ئەگەر هەر دەرگام لێ ناکەنەوە چەند هێلکەم بۆ تێشووی سەفەر بۆ تێکنێن.

ژنەکان بە پەلە نان و هێلکەیان بۆ تێکەوە پێچا و بە دەلاقەیدا بۆیان فڕێ دا دەرێ .

پاڵەوان ماڵی بەجێ هێشت و لە ئاوایی وەدەر کەوت . کەم رۆیی ، زۆر رۆیی ، تووشی مام رێوی بوو . رێوی کە دیتی پاڵەوان زۆر دەترسێ و وەک جاو سپی

بۆتەوە گوتی :

ـ بەبە پاڵەوان فس فس مەرحەبا ! لە ئاسمانێم دەویستی لە عەرزم وەدەس کەوتی . زۆرم برسی‌یە زووکە درێژبە با بتخۆم ، پاڵەوان لە هەیبەتان نێوکی کەوت. چاوی بە مۆڵەق وەستا ، گوتی :

ـ ئێستا کە هەر دەمکوژی راوەستە با دەس نوێژ هەڵگرم ، نوێژی بکەم ، جا ئەوجار درێژ دەبم بە پاک و خاوێنی بمخۆ!

مام رێوی گوتی: حەیە حەی نوێژ دەکا ؟من دەلێم زۆرم برسی‌یە زۆر !!!

پاڵەوان ئەوجار کە چاری برا گوتی :

ـ باشە ئەگەر وایە هەتا دەس نوێژ هەڵدەگرم بۆ وەی برسی نەبی تەشریفت ئەو نان و هێلکەیە بخۆ. جا ئەگەر تێر نەبووی منیش بخۆ !

مام رێوی لمبۆزی لە حەوا گرت و کلکی راوەشاند ، یانی باشە !

رێوی دەستی کرد بە هێلکە خواردن و پاڵەوان کە دیتی کاری کراوە هەڵات .

کەم رۆیی زۆر رۆیی تەمەشای کرد ئەگەر شەو لە دەرێ بمێنێتەوە دڕندە و زەرەندە دەیخۆن . چاوی گێرا ئەشکەوتێکی دیتەوە ، لەبەرە خۆیەوە گوتی :

ـ ئەها ئەوەی لێی دەگەڕێم ئێرەیە . بە هەزار زەحمەت و نەقە نەق بە ئەشکەوتێ هەڵگەڕا . دیتی زۆر تاریکە پاش تاوێک کە چاوەکانی خوویان بە تاریکایی گرت تەمەشای کرد دێوێکی فیلەنتەری زەلام چوار مێردەکی دانیشتووە و دووبەرداشی گەورەی لە گوێ دایە دێوی چی گوێ وەک لێف ، چاوی وەک سێف ، بەژنی وەک کێف،

پاڵەوان لە جێی خۆ وشک بوو .

دێوە نەڕاندی :

ـ بۆن دێ ـ بۆنی ئادەمیزاد دێ ، لەو دەرک و بانە دێ . زووکە ئادەمیزاد وەرە پێشێ برسیمە . بڵێ بزانم نێوت چیە؟

پاڵەوان فس فس کە لە ترسان ددانی ددانی نەدەگرت گوتی :

ـ قوربان نێوم . یانی نێوم ، نێوی من پاڵەوان ... پاڵەوانە ، ئیمشەو میوانی تۆم ، جێگام بدەیە ، سبەینێ دەڕۆم . باشە ؟

لەو دەمەیدا چل کوڕەی دێڵە دێو هاتنەوە ماڵێ . هەر یەکەی کارێکی وای دەکرد کە پاڵەوان لینگی وەک داری تەپڵی لێهاتبوو . یەکیان بەردی دەگوشی دەیکرد بە ئاو ، یەکیان وڵاتی دەسووتاند بەچاو ئەویدی پیرە داری بە ریشەوە هەڵدەکێشا ، یەکی دی بەرداشی بە قامکی هەڵدەسووڕاند .

پاڵەوان زانی ئەگەر بێدەنگ دانیشێ کاری دەکرێ و زوو دەیخۆن . هەر بۆیە هێلکەیەکی دەرهێنا و گوتی :

ـ ئێوە ئاو لە بەردی دێنن بەڵام من جەراحەت و زووخاوی لێ دێنم .ئەوەندی گوت و هێلکەی ڕێک کوشی و زەردێنە و سپێنە تێکەڵ بوو و ڕژا سەر عەرز .

دێوەکان گوتیان :

ـ با چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە دەنا ئەوشۆ هەموومان دەکوژێ . دێڵە دێو تەندوورەیەکی کرد و نێو ئەشکەوتی کرد بە سەحرای تۆفان لێدراو . پاڵەوان بە بەری میچەوە نووسا . دێڵە دێو هاواری کرد :

ـ پاڵەوان ئەوە بۆ چوویە حەوا ؟

ـ ئەوە لە گوزر و مەتاڵە کۆنەکەی بابم دەگەڕێم .

دێڵە دێو بە کوڕەکانی گوت :

چارەیەکی بۆ نەدۆزنەوە هەمووومان دەکوژێ . جارێ با دەری کەینە دەرێ دوایە تەگبیران دەکەین . پاڵەوانیان وەدەرنا و ئەویش بە پەلە لە ڕۆچنەی ئەشکەوتەوە چاوی لە دێوان بڕی بزانی دەڵێن چی . ئەوانیش قەرار و بڕیان دانا کە شەو پاڵەوان لە چوار داخی باخی دا بخەوێنن نیوە شەوێ بچن و بە شمشیران لەت و پەتی کەن. پاڵەوان گوێی لێ بوو هاتەوە خوارێ پێیان گوت دەبێ شەوێ لە باخ بخەوی .

گوتی : لیفە و سەنیرێکم بدەنێ دەڕۆم ، لیفە شڕەیەکیان دایە و پاڵاوتی بۆ نێو باخی ، بەڵام نەنووست . سەنیرەکەی درێژ کرد و لیفەکەی پێدا دا و چوو لە سووچێک مات بوو .

شەو ڕاشکا و دێوان هاتن و سەنیر و لێفەیان وەبەر زەبران دا . ئەوجار کە دیتیان متەقی لەبەر نایە بە جێیان هێشت دوا بە دوای وان پاڵەوان بەرەو ئەشکەوت وەڕێ کەوت . لێفە شڕەشی بە دوای خۆیدا دەکێشا .

گەیشتەوە نێو ئەشکەوتەکە . دێوەکان واقیان وڕما ، دێڵە دیو پرسی :

ـ پاڵەوان چاک نووستی ؟ هیچت لێ نەقەوما ؟

گوتی : ناوەڵڵا بەڵام لەبەر مێشووڵان خەوم لێنەکەوت ، دێوەکان هەر یەکە بە لایەکدا دەرە دزەیان کرد و هەڵاتن .هەرچی زێڕ و زێو بوو بۆ پاڵەوان فس‌فس بەجێما. باری کرد و بەرەوماڵ بۆوە . لەم لاشەوە دێوەکان تووشی ڕێوی هاتن و بەسەر ـ هاتەکەیان بۆ گێڕاوە . ڕێوی گوتی :

ـ پاڵەوان فس فس لەمن دەترسێ . وەرن با زێڕ و زێوەکەتان بۆ بستێنمەوە . ئەوەندەیان گوت و وەڕێ کەوتن .

بەڵام پاڵەوان کە هەموو زێڕ و زێوی دێوانی کۆ کردبۆوە بە شانی دادا و بەرەو ئاوایی وەڕێ کەوت . هەر کە گەیشتەوە ماڵێ ژنەکانی بەرەو پیری چوون و دەرکەیان لێ کردەوە . پاڵەوان وەژوور کەوت بەڵام دانەنیشت . زانی هەر ئێستا دێنە زگی و دێوەکان تۆڵەی لێ دەکەنەوە هەر بۆیە هەرچی دیزە شکاو و گۆزە شکاوی پێ شک دەهات لەسەر یەک کەڵەکەی کرد و چاوە ڕوان بوو .

دێوەکان هاتن . وەژوور کەوتن.چاویان بە پاڵەوان کەوت. پاڵەوان فس فس پاڵێکی بە گۆزە شکاوەکانەوە نا .هەمووی بەسەر دێواندا دا .هەر بابا بوو هەڵدەهات

ئەوجار ئیدی پاڵەوان فس‌فس بە ئاسوودەیی دەستی بە ژیان کرد و لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی بێ ترس و خۆف پێی ڕاکێشا منیش هاتمەوە .

کاڵەم دڕا ، چم پێ نەبڕا

# مەولەوی

سەلاحی یۆسفی

لە داوێنی هەست بزوێنی تەبیعەتدا کەسانێک پەروەردە دەبن کە بە پێی ویستی دڵ و خۆشەویستی و بۆ پاراستنی فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوەکەیان دەست بۆ قەڵەم دەبەن . کارەساتی مێژوو، زوڵم و زۆری زۆرداران ، لێ قەومان و دەر بەدەری ئیمان و بڕوای ئاینی ،ئەوین و خۆشەویستی جوانی یەکانی تەبیعەت ، خۆشی و کامەرانی و ... هەر یەکە یا بە گشتی لە نێو هەر دەستە و کۆمەڵێکی ئینسانیدا دەبنە هۆی بزووتنی ناسکترین و جوانترین هەستەکان و وردە وردە بە شکڵی داستان ، ئەفسانە ، چیرۆک ، پەند ، شیعر و بەیت و باو و قسەی خۆش و ... خۆ دەنوێنن . لەم قۆناخەدا یەکێک وەدوای فۆلکلۆری نەتەوەکەی دەکەوێ لە دیوەخانان ،لەپاڵ کەپر و تاوڵ و چادران گوێ بۆ قسەی دەیان پیرێژنی پێچووکە سپی شل دەکا و پێڵاوی لاوەتی لەو ڕێگە دوور و درێژەدا دەدڕێنێ ، لە کوورەی دڵی یەکێکیدا پارچە شیعرێک، قەسیدە یا غەزەلێک ئاورینگان دەدا یا ئەفسانە و چیرۆکێکی جوان دەخولقێنێ و چرایەکی پڕشنگدار لە سەر ڕێی کۆمەڵ هەڵ دەکا .

جێی خۆیەتی بڵێین گەلی کورد خاوەنی فەرهەنگ و ئەدەبێکی بە نرخە کە مایەی شانازی‌یە ، بەڵام بەداخەوە زوڵم و زۆر و دەسدرێژی بێگانەکان و نەخوێندەواری و زۆر هۆی دیکە بوونە بەرگری خزمەتێکی باش بە فەرهەنگ و ئەدەبی ئەو گەلە هەژار و زۆر لێکراوە . بەڵام دەکرێ بڵێین لە سەدەی نۆزردەهەمدا شۆڕشێکی ئەدەبی لە

کوردستان پێک هاتووە و دەیان شاعیر و ئەدیبی باش هەڵکەوتوون . لە ئەدەبیاتی ئەو سەدەیەدا شیعر و شاعیری زۆرتر وەبەر چاو دێ . شاعیر مەلی خۆش ئاوازی چیمەن و گوڵزاری بیر و خەیاڵە،شاعیر پەپوولەیەکی روح سووکە کە مزگێنی سروەی بەیانی بەهار بۆ گوڵانی خەواڵوو دێنێ . شاعیر شەمێکە کە دەسووتێ تا بەزمی گەل رووناک بکا .

لە ئاسمانی ئەدەبی کوردەواریدا سەدان ئەستێرەی پڕشنگدار دەدرەوشێنەوە و ترووسکەیان رۆشن کەرەوەی تاریکانی ژیانی هەر کوردێکی دڵسۆزە ، یەکێک لە

شیعری مەولەوی لە ناسکیدا وەک گوڵاڵە سوورەی کۆسالان کە بە پڕیشکی خوناوەی بەهاری رازابێتەوە و پاراو بووبێ شلک و جوان، نەرم ، لەبار و گەشە ، خۆی لە تەشبیهاتی کۆن لاداوە و پەنجەرەیەکی بەرەو تەشبیهاتی جوان و نوێ کردۆتەوە کە لە نەوعی خۆیدا کەم وێنەیە .

گەشترین ئەستێرەکان لەسەر ئاسۆی ساو و بێ گەردی هەورامان بەرانبەر بە تاوگە بەرز و خوڕێنەکانی کۆسالان و شاهۆ خۆ دەنوێنێ.دەبێ کێ بێ ؟

بەڵێ .. ( **مەولەوی** ) یە عارف و شاعیری گەورەی سەدەی رابردوو .

**کورتە باسێکی ژیانی مەولەوی**

ناوی (سیّد عبدالرّحیم)و کوڕی"مەلاسەعید"ە بە شەش پشت دەچێتەوە سەر(مەلا ئەبووبەکری " مصنّف چۆڕی ")خاوەنی کتێبی (الوضوح)لە بنەماڵەی عارفی هێژا و مەزن(سیّد محمّد ـ زاهد)ە کە بە ( پیر خدری شاهۆ) مەشهوورە . هەر چەند تەخەللوسی شیعری"معدومی" بووە بەڵام لە ناو خەڵک و ئودەبادا بە "مەولەوی" نێوبانگی دەرچووە .

مەولەوی ساڵی ١٢٢١ی کۆچی لە بنەماڵەیەکی ئایینی گوندی"سەرشاتە"ی تاوەگۆز لە دایک بووە .بە منداڵی لە خزمەت باوکی قورئانی پیرۆزی خەتم کردووە و وەک هەموو فەقێکانی کوردستان رێگەی عیلم و زانستی گرتۆتە بەر و لە زۆربەی شار و گوندەکانی کوردستان وەک " پاوە ، چۆڕ، سنە ، بانە ، سلێمانی ، هەڵەبجە ، جوانرۆ و .. " دا لە خزمەت مامۆستا و زانایانی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی ، ئەوجار کە لە خوێندن بۆتەوە ، وێڕای شەریعەت رێگای تەریقەتیشی گرتۆتە بەر و بۆتە خەلیفەی " شیخ سراج الدّین "ی نەقشبەندی و پاشان " شیخ بهاءالدّین "ی کوڕی .

**عیرفان و فەلسەفە لە شیعری مەولەوی دا**

بێ شک هەرکەس چاوێکی بە شیعرەکانی مەولەویدا خشاندبێ بۆی دەردەکەوێ کە شیعرەکانی ئاوێنەی عیرفانن ، بە زمانێکی دیکە مەولەوی لە هونەر و نبووغی زاتی خۆی بۆ ناساندنی باشتری عیرفان کەلک وەردەگرێ و بە سۆز و ئاهەنگی تایبەتی شیعرە نەرم و مەحزوونەکانی .پەنجەرەیەکیش بەرەو فەلسەفە دەکاتەوە . ئیمان و باوەڕی قەلبی ، ریازەت و شەونخوونی،تەعەهودێکی ئەدەبی و ئەخلاقی دەدا بە شیعر کە جێی لێکۆڵینەوە و سەرنجە .هەرچەند لە هەر مەسنەوی ، لە هەر بەیت و میسراع وتەنانەت لە هەر پیتێکیشدا بۆن و بەرامەی عیرفان و خودا ناسی و یادی حەق و پیر ،نەوازیشگەری چاو و دڵن ، بەڵام دەتوانین دوو بەشی گرینگ دیاری بکەین . یەکەم : شیعری

عیرفانی کە بە شێوەی راز و نیاز لەگەڵ خودای گەورە، ئیزهاری هەژاری و وەسفی هێز و توانای باری تەعالا لە قالبێکی جوان و لەباردا کە لەباری سەناعاتی شیعری و نێوەرۆکەوە پڕ بایەخ و کەم وێنەن، سۆز و بڵێسەی دەروونی مەولەوی هێند ئاگرین و بەتینە کە فرمێسکی چاو دەبارێنێ و دڵ دەتاوێنێ ... بەڵی ئەوین دەگاتە ئەو رادەیە " معدومی "یەکی شەیدا کە بوونی دە نەبووندا تەخەللوسە و شەو و رۆژ لە گۆشەی حوجرەی مزگەوتدا خەریکی عیبادەت و راز ونیازە وبە ئەسرین و سۆزی دڵەوە ئایاتی قورئان لەبەر دەکا و دڵی تینووی پێ تێراو دەبێ وەک گوناهبارێکی شەرمەزار بناڵێنێ و بڵێ :

**من وێم مزانوو بێ ئەمریم کەردەن**
**ئیتاعەی فەرمان عەبدیم نەبەردەن**
**عومرم سەراپا غەرق غەفلەتەن**
**زاد ئاخرم بار خەجلەتەن**
**بەڵام مەشیۆ تۆ وە فەزڵەکەی وێت**
**کردەی من نەبۆ بەهانە پەرێت**
**ئیغمازکەی جە گرد نابەکاری من**
**جە رووسیایی و بەدکرداری من**

جارێک مانگی موبارەکی رەمەزان بە زمانی بەڕۆژوو لە ( رەزاو ) بەرەو (دەگاگا ) لە هەورامانی تەخت دەگەڕامەوە، زۆر گەرم بوو گەلێکیش ماندوو ببووم ، لەسەر رێ لە جێ یەک کە پێی دەڵێن " کەڵی **مل**" گەیشتمە باغێکی زۆر خۆش و بەسەفا ، کانیاوێکی لێ بوو ئاوەکەی وەک چاوی قرژاڵی روون بوو، دارە هەرمێ و قەیسی و توو سەرنجیان بۆ لای خۆ راکێشام، لام دا لەبەر سێبەریان تاوێک بحەسێمەوە ، نەوسیش زۆری بۆ هێنا بووم رۆژووەکەم بشکێنم و ئەو هەلە لە دەست نەدەم. لە ژێر دارە گوێزێک لەپاڵ کانیاوەکە چاوم بە پیرە پیاوێکی فەرنجی لەشان و کەڵاش لە پێ کەوت کە پێمەڕەیەکی لە باوەش گرتبوو و پاڵی وەدارەکە دابوو. سڵاوم کرد لەبەرم هەستا و بانگی کرد بچمە لای ، دەمێکی خۆش ئەو بە هەورامی و من بە سۆرانی دەگەڵ یەک دواین ، بە هەر شێوەیەک بوو یەکترمان حاڵی دەکرد. لاللۆ بەمەی زانی کە زۆر تامەزرۆی هەرمێ و قەیسییەکانم و بەڕۆژووشم ،منیش شەرمم دەکرد داوای شتێکی لێ بکەم،پاش تاوێک ئاخێکی لە ناخی دڵەوە هەڵکێشا و گوتی : "ئەگەر پەلەت نیا با شیعرێت پەی وەنوو " تکام لێ کرد ئەوکارە بکات، جا بە سۆزەوە گوتی :

نەفس بەدکردار ،بێ دین بەدبەخت ،
شووم سەرگەردان خەیاڵان سەخت !
پەی چێش عادەتت وەگوناە کەردەن،
ژار مەحرووم رەحمەتت وەردەن ،
راگەی حەقیقەت جە ویرت شیەن ،
یادت پەی مەحبووب حەقیقی نیەن،
مۆتن ئەسڵێت نەخاتر لوان ،
مێخ مۆبەتت نەرووی خاک کوان ،
دایم گورفتار ئارەزووی خامی
یەکسانەن پەرێت نیکی و بەدنامی
گا خەریک دەرد هەوای مەجازی
گا مەشغووڵ کەسب کیبر و نیازی
گا غەرق هەوای وەسڵ نازاری
گا حیرەت زەدەی روخسار یاری
هیچ هۆشت نیەن حەق خەوەردارەن
فەردا رووی حیساب میزان کارەن
فکرێ کەرەوە وادەی لواتەن
وەخت شێویای شەوق سەوداتەن
باوەرە وەدەس زادێ پەی سەفەر
وێت نەوسەفەردا بێ تۆشە مەکەر
وە دەرگای حەق بەر رووی پەشیمانی
عوزر ئاوەری کەر کردەی نادانی
بەڵ لیباس عەفو بکەرۆت خەلات
جە وەخت مەردەن بەرەرۆت نەجات
وە نەسیوت بۆ سەرمایەی ئیمان
نەوی وەریشخەند سوخریەی شەیتان
وە رووی مەحشەردا بگێڵی دلشاد
جە قەید عوسیان دلت بۆ ئازاد

لالۆ بە گۆشەی پشتێند فرمێسکی گەشی لەسەر ردێنە سپی یە جوانەکەی دەسڕی یەوە و منیش لە شەرمان عارەقەم دەرکرد ، ئەودەمی نەمزانی ئەو شیعرە جوانە ئی کێ یە و نەشم پرسی بەڵام دوایە لە دیوانە بەرزەکەی مەولەویدا چاوم پێ کەوت .

دووهەم :تەریقەت و پیر لە شیعردا :

تەئسیری مەعنەوی پیری تەریقەت ، شیخ ـ "سراج الدّین" و باقی گەورەکانی نەقشبەندی لە زۆربەی شیعرەکانی " مەولەوی"دا دیارە. پاش وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی دەبێتە خەلیفەی "شێخ" و جوانتر لە هەرئەویندارێک بە مەحبووبی خۆی هەڵدەلێ و دەبێژی :

...........

**دەماخ وە نەشئەی سەربەرزان کەیل**
**مورشید میرا و سەرجۆی بادەی لەیل**
**ئەنیس مەجلیس عەیش و نیشاتم**
**دەسگیر راگەی هات و نەهاتم**
**جڵەو کێش زەوق ئاهووی رەوێڵم**
**بەزم ئارای مەجلیس کەمەن وەپێڵم**

**خەیاڵی ناسک و مەولەوی**

شیعری مەولەوی لە ناسکی دا وەک گوڵاڵە سوورەی کۆسالان کە بە پڕیشکی خوناوەی بەهاری رازابێتەوە و پاراو بووبێ شلک و جوان ، نەرم ، لەبار و گەشە ، خۆی لە تەشبیهاتی کۆن لاداوە و پەنجەرەیەکی بەرەو تەشبیهاتی جوان و نوێ کردۆتەوە کە لە نەوعی خۆیدا کەم وێنەیە .

**گوڵ چون رووی ئازیز نەزاکەت پۆشان**
**وەفراوان چون سەیل دیدەی مەنجۆشان**
**مدیان گوڵاڵان نەپای دەربەندان**
**ئەو یەکتر وێنەی ئارەزوومەندان**

سەیرێکی ئەم تەشبیهە بکەن، بڕوانن چەند جوان و نوێ یە. چەند بە مامۆستایی و شارەزایی جێگای "مشبّە" و مشبّەٌبە"ی گۆڕیوە. ئەوە ئەوەڵ و ئاخری ئەم وێنە و تابلۆ جوانانە نیە، بەڵکوو دەیان وێنەی تر

هەن کە لە هەر کامیاندا جوانیی‌یەکـــی تایبەتی دەبیندرێ .

شیعرێک لە ناخی دڵدا جێ دەکاتـــەوە شاعیری لە خەو راپەڕاندبێ ، خەوی لـــە چاوان تۆراندبێ و خورپەی خستبێتە دڵـــی . چەند خۆشە ئەو هەستە ناسکە بە شنـــەی وشەی جوان لەرابێتەوە .شیعری مـەولـەوی بە هەموو وردی و ناسکی‌یەوە لە ئاستـــی هەڵبژاردنی وشەی جوان و هاوڕەدیف زۆر خەنی و پـڕە ، لەگەڵ ئەوەشدا بایەخـــی پتری بۆ نێوەرۆک داناوە . خوێنەر بـــە روانینێک لە بۆنی جیناسە شیـرینەکـــان شنۆیەکی بە دەماخ دەگا و تێدەپەڕێ ، وا دەزانی تێگەیوە بەڵام پاش تاوێک لە هەر جێ یەکە رادەوەستێ ، ئـەنگوستـــی دەگـەزێ و دەگەڕێتەوە ، هەر چەند جارێکی دەیخوێنێتەوە شتێکی تازەتری تێدا دەبینێ

**خـەرمـانی خەمان ها وە کەل باوە**
**شەن کەر یەکێوەن دوو شەن وە لاوە**

یا :

**یاران ، دڵداران نە تۆی دڵ داران**
**بێ یاد یاران ، یاران مەویاران**

شاعیر ورد بینە ، موو قەڵێشە ، زۆر شت چاوی سەر دەیبینێ بەڵام چاوی گیـــان نایناسێ. سەیر کەن چۆن لەتکی گـــۆزە شکاوێک سەرنجی شاعیر رادەکێشـــێ و دەگەڵ پیری و کەنەفتی خۆی هەڵی‌دەسەنگێنێ

**داخۆ چەن وەدەس نازک نـەوهـالان**
**ئامۆشۆت کەردەن پەی دڵێ مـالان**
**ئیسە ها چون من پەشێویت بێحـاڵ**
**کەفتەنی نەخاک مەکەرات پامال**

مەولەوی لە هیچ شتێک بەپەلە ناگوزەرێ. زۆر بە جوانی لێی ورد دەبێتەوە و تا وەک خۆی هەستی پێ نەکا لێی لانادا ، لە وەرزی بەهاردا کاتێک لە هەر لایەکەوە گوڵ و گوڵزار بە وێنەی رووی یـــاری دەدرەوشێنەوە ، لە دووری و فیراقی‌یار، چاو دە لالەیەک دەبـڕێ.

**جە هەر تەرەفدا مەوینوون گوڵزار**
**رەنگ رەنگ مەدرەوشۆ بە وێنەی دڵدار**
**لالە گەردن کەچ تۆی دیدە رەشتەن**
**گۆیا عەکس یار وە رووشدا وەشتەن**

### ئەوین و مەولەوی

سەرچاوکەی شیعری روونی ئـەوینـــی مەولەوی " عەنبەر خاتوون"ی خێزانی‌یـــە . عەنبەر خاتوون لـە بنـەماڵـەی ئـەو ئەفغانی‌یانە بووە کە روویان لـــە " چۆڕستانە" کردبوو و لەوێ نیشتەجێ ببوون رەنگبێ هۆی ناسراوی سەید عبدالرّحیم بە " مەولەوی"ش هەر ئەوان بووبن ، چونکـو دابی حەنەفی مەزەبان ئەوەیە کە بـە ماموستاکانی ئایینی خۆیان دەڵێـــن " مەولەوی " .

مەولەوی پێش مارە بڕینی عەنبەر خاتوون بۆ خوازبێنی دەچتە ماڵیان و بۆ ئـەوەی چاوی پێ بکەوێ داوای ماستاوێک دەکـا . کاتێک عەنبەر خاتوون ماستاوەکە دێنێ ، دەڵێ: فەرموو خاڵۆ! ئەویش بەو موناسەبەوە ئەم دوو دێڕە دەڵێ :

**خاڵۆ خاڵۆتەن کەم واچە خاڵـۆ**
**خاڵۆ دەم وەبان خالێنت ماڵـۆ**
**شەرت بۆ من جە داخ خاڵۆ خاڵۆی تۆ**
**وێم کەروو وەکوڕ چواردە ساڵەی نۆ**

ئەویندارى مەولەوی لە کەلێن و قوژبن و جێژواندا پێ ناگا ، بەڵکوو عەشقێکی پاک و بێ گەردە کە لە کاتی مارەبڕینەوە دەست پێ دەکا و تا مردن درێژەی دەبێ .

مەولەوی لە ساڵەکانی ئاخری ژیـانـــی تووشی زۆر گیر و گرفت و چەرمەسەری دێ ، کتێبخانەکەی دەسووتێ، زۆر کتێب و شیعری تێدا لە ناو دەچێ و بە سکالا بۆ دۆستێکـــی

ل ٩٨

هەر دووکمان لە وەتاغی شیرکەتێکی سەر بە دەرەوە کارمان دەکرد. من دەفتەردار بووم و ئەویش بایگان بوو.

کوڕێکی زۆر ساویلکە بوو ژن و منداڵی نەبوو. زۆر جاران دادەنیشتین پێکەوە دەردی دڵمان دەکرد. سەربرانەی قسەی ئەو هاوکارەم ئەمە بوو کە لەبەر بێ ژن وماڵی زۆر حەولە و ناتوانێ بە هەموو کارێک رابگا. ماوەیەک لە تەمەنی رابوارد بوو بەڵام ئێستا ئەوەی دەیویست پێی نەگەیشتبوو.

منیش کە بە خۆم و شەش تمەنە حقووقەوە سێ چوار منداڵم بە ریشەوە بوو دەمزانی زۆر ئاسوودەیە و لە لانێک حەق بەو بوو. ئەویش کابرا بە رۆژ کارێ بکا و ماندوو حەسێنەوەی دەسکەنەی نیسکان بێ زۆر ناخوشە.

ئەوەی بەلای منەوە سەیر بوو ئەوە بوو کە سەرەڕای ئەوە کە سەڵت و رەبەن بوو کۆک و پۆشتە بوو، کەوش و پێلاوی بۆ یاغ لێدراو بوو..

بەڵام من بە هیچ رانەدەگەیشتم و کەوش کڕینم لە هەموو شتی دنیایە پێ ناخۆشتر بوو. چون لە لایەک، لایەکی حقووقەکەی بڕ دەدا و لە لایەکی دیکەشەوە بە ناشکوری ناڵێم لاقم زۆر گەورەیە و کەم وا هەیە ئەو کەوشەی دەستی لەسەردادەنێم نمرەی لاقی من وەدەس کەوێ جا بەم دوو هۆیە کەوشەکانم هەتا شڕ دەبن هەر لە پێم دان.

دۆستایەتی من و هاوکارەکەم ئەوەندە گەرم ببوو کە هیچمان لێک نەدەشاردەوە. تەنانەت رۆژیک لە نێو قساندا درکاندی کە:

ـ فلان کەس تۆش لە خۆی .. من ئەوەی لێی دەگەڕام دیتوومەوە.

ـ یانی مەبەستت ئەوەیە دەتەوی زەماوەند بکەی؟

ـ بەڵێ بەڵێ ئیدی بەسە من وا هەڵناکەم.

ـ خودا لێت مەبارەک کا. بە سەر و دڵێکی خۆش! بەختەوەر بی! ئەدی شیرنی کەنگێ دەخۆین؟

ـ ماڵتە تۆ بۆ هێندە چڵێسی پێت خۆشە من وەبەر ماشێنی کەوم شەش مانگان لەسەر رەقی پشتێ بکەوم بەڵام بەو مەرجەی تو بێی و سەرم بدەی و شیرنی بخۆی؟

ـ کوڕە بابە ئەو فەرمایشە گلاوانە چن دەیانفەرمووی؟

ـ مەگەر هەموو جارێ بۆ خۆت وانالێی. دەی بە هەر حاڵ کاکە جارێ نەرێسراوە

نە پێچراوە جۆلا شەقەی دێ !
من دیتوومەتەوە دەمەوێ
بنێرمە سەری .
– ئەها ببوورە نەمزانی.دەی
دیسانیش هەر مەبارەکی دەوێ
– برالە دەمەوێ وەک دوستێکی
باش یاریدەم بدەی .
– دەفەرمووی چ بکەم؟
– عەرز بێ تۆ دنیات دیوە ،
خوازبێنیت کردووە ، دەتوانی
لەگەڵم بێی ، وێکرا دەچین ،
بۆ خۆت دەزانی بە هەر کەس
دەڵێم گاڵتەم پێ دەکا و
وا دەزانێ من جەفەنگ
لێدەدەم . بەڵام بەراستیمە!
لانی کەم ئەمجارە بەراستیمە!
– زۆر باشە بەسەر چاوم من
حازرم. بەڵام تەگەرەم زۆر
لەپێشن و ئەوانەم بەم دەم و
دەستە بۆ جێ بە جێ نابێ .
جارێ نە بەرگم هەیە نە پێڵاو
– ئەوە هیچ نیە . ئەوەت
لەستۆی من. ئیدی بیانووت
لێبڕا ؟
– بە سەری تۆ بیانوو نیە
بەڵام ئەگەر ئەوانەم بۆ
جێ بە جێ کەی لەسەر چاوی
دادەنێم و خوازبێنیت بۆ
دەکەم .

بەڵێ قەرار و بڕیمان
دانا هەتا رۆژیک بە پەلە
هاتەوە شیرکەت و گوتی:
فەرموو .

تەمەشام کرد ، دەستێکی
کۆت و شاڵوار بۆ هێناوم
لەگەڵ جووتێک کەوشی بریقەدار
بە دیتنی ئەوان کەیفخۆش
بووم و پێم خۆش بوو دایم و
سەعات خەریکی خوازبێنی بم
بۆ ئەو هاوکارە بەرێزەم.
کۆت و شاڵوارەکەم لەبەر کرد
هێندێک تەنگ بوو دەتگوت
کیفە کێشکە بەڵام قەیدی
نەبوو بۆ ماوەی نیو سەعات
پیاو دەتوانێ خوێ تێدا
رابگرێ، ئەوجار کەوشەکەم
کێشا پێش خۆم هەتا لە پێی
کەم بەڵام بۆ لاقم نەبوو.
گوتم،دەی هێندێکی دیکە
حەول بدەم بەڵکوو بتوانم
ئەوەندە پێی بڕۆم کە چی
نەخێر دوو نمرە بۆ لاقم
چووک بوو. دەنا قەیتانیشی
تێدا بوو ...

بۆ خۆشی ئەوەی دەزانی
بەڵام دەیویست پێم بسەلمێنێ
کەوشی تەنگ چاکترە. گوتی :
– کاکە گیان ئەو کەوشە
زەلامانەی تۆ دەڵێی قەبری
منداڵی ساوان! جا چۆن لە
رووت هەڵدێ بەم کەوشانەوە
بۆ من بچی بۆ خوازبێنی .
خەڵکی ئەم دەور و زەمانە
عەقڵیان لە چاویاندایە
بۆیە ئەگەر ئەو کەوشە جوانە
بریقەدارە لەبەرکەی وێچووتری
خۆ هیچ نەبێ لەم کەوشە
حەوت رەنگیلەی خۆت جوانترە!
– بێفایدەیە ، بۆ پێم نابێ.
زۆری پێ تێک چوو.دیار بوو
لەم قسەیە نارەحەتە چونکوو
گوتی :
– تەمەشای دۆستی ئەم دەور
و زەمانە.حازر نیە نیو
سەعات لەبەر خاتری دۆستی
خۆی تاڵی بچێژێ .
– برالە کەوشەکە بۆ پێم
نابێ دەنا حازرم. خۆ من
هیچ ناڵێم .
– دەی جا چ بوونیو سەعاتمان
پێ دەچێ . دوایە فرێیان دە
ئێستاش بە تاکسی دەرۆین
هەتا دەگەینە بەردەرکەی.
لەوێش را دوو پلیکانە وەسەر
دەکەوین. لە ژوورێش
کەوشەکان دادەکەنی .
– زۆر باشە. ئەوەندەی گوت
و بە مرخێش مرخێش و کێش –
مەکێش کەوشی لە پێ کردم.
بەڵام لاقم دەتگوت ئاوی
کوڵیوی پێدا کراوە.
قامکەکانم نووشتابوونەوە و
جوان جوان لە بان کەوشەکەوە
دیار بوون . یارەبی
دوژمنیشتان کەوشەکەی تەنگ
نەبێ . ئەوجار نەمدەتوانی
بڕۆم. هاوکارەکەم هاتە بن
پیلم و هەتا سەر خیابانی
بردم. لەوێ سواری تاکسی
بووین و بەرەو ماڵە کابرای
گۆڕین وەڕێ کەوتین .

ئەو ئازارەی من لە
تاکسیدا چێشتم هەر بەشی
کافران بێ . چما یەکێک
خۆی لێدا بام چاوم نەدەکوڵی
نازانم بۆ وابووم. هەر لە
خۆڕا قەڵس و توورە بووم و
پێم خۆش نەبوو کەس بمدوێنێ
هەر کە دەجووڵامەوە دەتگوت
بە تەور داس قامکەکانم
دەپەڕێنن .

تازە چارم ناچار بوو ئەگەر کەوشەکەم بەسەر پێوە کردبایە دۆستەکەم ناڕەحەت دەبوو و دەیگوت نابێ لە مەجلیس کەوش بەسەر پێوە بکەی . ئاخر لەکنە خۆ من نوێنەری زاوا بووم بۆ خواستنی بووک .دەبا نموونەی ئەدەب و حەیا بم .

تاکسی رایگرت و منی شەل و گێر وەک نەخۆشێکی تازە لە نەخۆشخانە گەڕابێتەوە لە ماشێن دابەزیم. تەپڵی سەرم لە هەموو جێگایەکم پتری دەچریکاند. لەوماوەدا کە من وا دەردە دار بووم هاوکارەکەم بۆی دەگوتم کە دەبێ چ بکەم و چ بڵێم. وەسەری کردبوو نەیدەماڵێیەوە

لە شەش حەوت پلیکانان وەسەر کەوتین و لە زەنگیدا. پاش تاوێک دەرگا کرایەوە و وەژوور کەوتین .

یا رەببەنا چ دەبینم؟ خۆ ئەو ماڵە ماڵە دەوڵەمەندانە هەر ئەو جێگایەی قەتم نەوێرا بوو خۆی لێدەم. هەرچی چاوم گێرا نەمزانی جێگای کەوش داکەندنی لە کوێیە . هەر لەو بیرەدابووم کە دیتم هەموو هەر بە کەوشەوەوە سەرکەوتوون و لە ساڵۆنێک لەسەر مۆبڵ دانیشتوون. بە دیتنی میوانان بەرەو پیرمان هاتن و وەک ئەمە کە زۆر خۆشەویست بین بەر لەمە کە ئیزنم بدەن

کەوشەکانم دەربێنم وەلای سەروویان خستم . بەڵام نەمدەتوانی قسان بکەم. لە تاو دەرد و ژانی قامکە درێژە نووشتاوەکانم عارەقەی رەش و شینم دەردەدا . لە تەپڵی سەرم ڕا هەتا بەری پێم عارەقە بوو . دەستەکانم لە نێوان هەر دووک ئەژنۆمدا رێک دەخشاند. جینگڵم دەدا. پێچم دەخوارد . بە کورتی ئەگەر یەکی ناشارەزا دیبامی دەیگوت رەنگ بێ شمشاڵی لێ بدا .

بەڕاستی هەستم دەکرد کە ئەو قامکانەی من زیادین . دەبێ فرێیان دەم. یەکێک بێ و بیانبڕێ. هاوکارەکەم بەرامبەر بە من دانیشتبوو خانەخوێش لە تەنیشتم . هاوکاری بەرێز سەمای دەکرد و ئیشارەی بۆ دەکردم هەتا راست بمەوە و قسان بکەم .

لەو دەمە دا شەربەتیان بۆ هێنایین . کیژۆڵەیەکی رەزا سووکت کەشەفێکی شەربەت پێ بوو .بەخێرهاتنی کردین و هەر یەکە لیوانێکی شەربەتی سوور لە پێش دانایین. لەگەڕانەوەدا کە بۆ هەموانی دانا بۆ بەدبەختی لاقی لەسەر لاقم دانا . هاتم هەرچەندی لەتوانام دایە هاوار کەم .وام لێهاتبوو لە حەیفان بگریم . جا وەرە پیاوێکی ئاوا لەبەر تەنگی کەوش بگری

خوشکە شەربەت بە پێکەنینەوە فەرمووی :

ــ بببوورە

هەرچی کردم و لە خۆم نووسام نەمتوانی ولامی بدەمەوە ئەگەر بە دوو کەسانیش لالغاوەیان کێشابام نەمدەتوانی پێبکەنم و تەنانەت بزەیەکی بە تۆبزیشم بۆ نەخرا سەر لێو .

دیسان باش بوو تۆزێک سوکنایيم له دلّی گەڕا بەلاّم رەنگ بێ نەزانن چ دەردێکم چێشت. دەتگوت به گازی قامکەکانم رێک دەکوشن هاوکاریش جار نا جارێک چەپ و چیر دەبوو گەرووی ساف دەکرد و به چاو و برۆ ئیشارەی دەکردم و لێوی هەلّدە چۆقاند. سەری لێ با دەدام بەلاّم " وشتر له خەیالێکی و وشترەوان له خەیالێکی" ئاخر من ئەوه بەو دەردەوه گرفتارم کابراش چاوی له زارمان بڕیوه که کەنگی فەرمایشی نازەنینی ئێمه له زارمان دێته دەر. دوای هێندێک قەراغ تێ- کردنەوه هاوکارەکەم بۆ خۆی وەقسه هات و خوازبێنی کرد. کابرا چاوێکی لەمن کرد و گوتی:

- با بیری لێ بکەمەوه چەند رۆژی دی بۆ خۆم پێتان رادەگەیەنم.

ئیدی جێگای راوەستان نەبوو هەناسەیەکم هەلّکێشا و هەستامه حەوا. وەدەرکەوتین لەبەر پلیکانان له دیوی دەرێ هاوکارەکەم دەستی به ناز و گلەیی کرد و لەبەر خاتری ئەوه که ئەرکی خۆم بەجێ نەهێنا بوو لێم زیز بوو و هیندەی نەمابوو هەر لەوێ کەوش و لیباسەکەم لێ بستێنێتەوه و به رووتی هەلّوەدای خەیابانانم کا. بەلاّم نازانم چۆن بوو رۆژێ ڕا لیّم تۆرا بوو. سەری داخست و رۆیی.

"خودایه بەکەوشەوه ناتوانم بڕۆم. به پێخواسیش که بڕۆم ئابڕووم دەچێ ئەدی چاره چیه؟"

به هەزجیره بابەیەک بوو هاتمه سەر شەقام و سواری تاکسی بووم. هەر که گەیشتمەوه مالّێ. ئۆخژنم کەوته دلّی. کەوشەکانم چاو پێکەوت ئەو کەوشانەی پێیان رازی نەبووم. ئەو کەوشانەی سەرەڕای ئەوه که زۆر گەوره بوون دوو رەنگیشیان دەنواند. سەرپەنجه و پاش پانێیان سپی ببۆوه و ئەم لا و ئەولاشیان رەش بوو. ئەگەر ئەو کەوشانەم دیت هێندەی نەمابوو لەسەر تەپلّی سەرمیان دانێم و ماچیان کەم... ده رۆژ رابرد. من هەروەها ئەو سەرقامکانەم بببوون یه بلۆق، هەدادانیان لێ هەلّگرتبووم. لەم ماوەدا هەر بیرم لەم خوازبێنی یه دەکردەوه که چۆن دەبێ سەربگرێ و ئەو دۆستەم بۆ وای له من کرد.

له ئیداره دەستم بۆ کار نەدەچوو. له پشت میزەکەم دادەنیشتم و چاوم له بلۆقەکانی لاقم دەبڕی. نەمدەوێرا گۆرەویش له پێ کەم ئیدی ئەو هاوکارەم سەری لێ نەدەدام و لەوێ هەروا لەو فکر و خەیالەدا بووم که له دەرگایان دا. فەرموویەکم گوت و دەرگا کرایەوه و کابرای گۆرین وەژوور کەوت. دوای هێندێک تۆ خۆش من خۆش و دانیشتن چایەکم له پێش دانا، حەساوه پالّی داوه، فەرمووی:

- کاکه من چاکم بیر لێ کردۆتەوه. ئەوێ رۆژێ له مالّی ئێمه بەڕاستی ئەو پەڕی شەرم و حەیات نواند. مالّته نەمدیوه پیاو لەو دەور و زەمانەدا ئەوەنده بەحەیا بێ. کوڕه له شەرمان سەرت هەلّنەدێنا. تەنانەت قسەیەکت نەکرد هەمووگیانت ئارەقه بوو. لێوت دەکرۆشت من هاتووم هەتا پێت بلّێم کچەکەمت دەدەمێ.

- یا دوازده ئیمامی دەشتی بەغدایه!! یا هەمووچاک و پیری دنیایه!! خودایه ئەو کەوشه تەنگانه چیان لێ کردم. خۆ هەر له لایەک بەلاّ نەبوون چەند بەلاّیان تووش کردم. دۆستێکیان له دەس دام. لاق و لەتەریان هەموو بریندار کردم. ئەوجار بەتەما بوو ژن و منداڵەکەشم لێ بکاته دوژمن.

تۆ له باتی من بای چت دەکرد؟!!!

# لەگەڵ شیعری

## ئەمشەو جێ ژوان سەرەولێژە

فەتاحی فەرهەنگ

نیوە شەوە و ...
شەو نخوونیم ئێشکگری باڵی خەوە
تارمایی یەک بەبەرچاوما دێت و دەچێ
کێیە ، بەم تاریکە شەوە ؟
سەرە تاتکێم لەگەڵ دەکا ؟
کێیە، بەم ناوەختە شەوە
ژینی تەنیایی و خەڵوەتیم لێ تاڵ دەکا ؟
ئاخۆ کێ بێ ؟
لە کاروانی چراخانی شەو جێمابێ !
کێ بێ بە دوای
بزەی دزراوی تارا بێ !
بۆ نازانێ شەوە و لە ترسی شەوارە
دەرگای دڵم داخستووە !

* * * * * *

لەو دیو دیواری بێدەنگی ،
غەڵبە غەڵبێک ...
دێتە بەر گوێم ،
دەڵێی سوارێک وا لە گەرووی تاریکی دا
دەرباز دەبێ و تاو دەدا بۆم .
ئای لەم شەوە،
ئای لەم شەوە،چەند درێژە !

* * * * * *

نیگاکانم ،
لەسەر توولە باریکی رێت ،
ئێشکگرن ،
شەو نخوونی بۆ شەوڕاوی تۆوە دەکەم .
بۆ چی نایەی ؟
چاوەڕوانتم زۆر لەمێژە ،
ئەگەر هاتی ،
وریای خۆت بە ،
ئەمشەو جێ ژوان سەرەولێژە .

* * * * * *

لە چاوی بەد بەدوور بن ،خوا دەوا میان بدا و دەستیان بە عومریەوە بگرێ لاوانی کورد ئەوەندەیان شیعر و چیرۆک و پەخشان بۆ ناردووین کە شەرمەزاریان کردووینەوە . چونکە لاپەڕەکانی سروە هەڵیان ناگرێ ، بڕیارمان دا کە نامیلکەیەک بە ناوی " هونەری لاوانی کورد " بڵاو بکەینەوە ،بۆیە داوا لە هەموو لاوێکی هونەرمەند دەکەین کە شوێنەوارەکانی خۆیان ( شیعر ، چیرۆک ، نەققاشی ، و وێنەی جوان )مان بۆ بنێرن . دەبێ ناو و نیشانی خۆیان بە تەواوی بنووسن ، جا ئەگەر پێیان خۆش بێ نازناوێک بۆ خۆیان هەڵبژێرن ، ئێمە شوێنەوارەکانیان بەو ناوەوە بڵاو دەکەینەوە . چاوەڕوانی چالاکی پتری ئێوەین .

## بیری کاڵ

«ئارام»

باڵندەکە زۆر مناڵ بوو
بیری کاڵ بوو
گوتیان مەڕۆ
ئەمڕۆ مەڕۆ
داوی باشوو تەشقی ئاسمانی تەنیوە
پێ دەکەنێ
تۆشی دیوە.
بە نەزانی
خو داوێیە بەر چنگاڵی
گوێی نەدانێ و فڕکەی باڵی
ئەوەندەی دی فریوەی دا بیری کاڵی .

# شاعیرانی لاو

## بریانە دڵ

ئەحمەدی مەولانی

ناپرسی ئازیزم لەمن بۆ وا بە دەرد و ژانە دڵ
بۆ بێ قەرار و تاقەتە،بۆ بێ سەر و سامانە دڵ

تیری موژەت پێکاویە جەرگ و هەناوم،گیانەکەم
باوەڕ ئەگەر ناکەی بەمن جارێ وەرە بڕوانە دڵ

رەنج و پەژارەت کوشتمی،غەرقم لەناو دەریای غەمت
بیماری دەردی عیشقی تۆم ، بێمەلحەم و دەرمانە دڵ

بێچارە و هیوا بڕاو،دێوانەیە بۆ زولفی خاو
دیلی دەسی دوومەستە چاو، دنیای لەلا زیندانە دڵ

گریانە کاری رۆژ و شەو،قەت ناسرەوێ یەک لەحزە ئەو
وەک تفلێ ساوا دوورە خەو، کاری گرووگریانە دڵ

ئاخر بەسە جەور و جەفا ، کاسەی سەبر پڕ بوو رژا
بۆ خۆشەویستی وەمەیلەکەت وا چاوەڕێی ئیحسانە دڵ

تاکەی بکەم شین و گرین ،شێوا و غەمبار و حەزین
سووتاندمی ئاوری ئەوین ، تۆخوا بەسە بریانە دڵ

داماو و مات و رەنجەڕۆ،تاکەی بکەم من شین و ڕۆ
هاوار لەدەست بێدادی تۆ، مەنعی مەکە میوانە دل

سیلەی نیگای چاوی رەشت وا شێت و شەیدای کردووم
مەجنوونی لەیلی مەیلی تۆم ئاوارە و وەیلانە دڵ

"ئەحمەد"غەم و گریان وشین،ناکا دەوای دەردی ئەوین
بۆ وەسڵی یاری نازەنین،چارەی دەس و دامانە دڵ

## تاسەی ئازادی

«جەعفەری خاوشی»

دنیا جێگەی ژیانە
جێی ژیانی ئینسانە

ئینسان لەهەر رەنگێ بێ
سپی و رەش ، ئی هەموانە

بەڵام رەشی بەستەزمان
کە لە رەنگی شەوانە

بەختی رەشە وەک لەشی
دیلە ، بێ جێگاو بانە

ناڵەیان لە ژێر قەمچی
دێ پڕ بەم ئاسمانە

دەڵێن بە دەنگی بەرز
رۆژی ئازادیمانە

بەڵام ناچێتە گوێ یان
ئەو سپی یە دڵ رەشانە

هەر دەیان چەوسیننەوە
بێ بەزەن ئەو رێویانە

خودایە کەی دەفەوتێ
زوڵمی ئەو زۆر دارانە

ئازاد و سەربەخۆ بین
لەم دنیا بەرز و پانە

دنیا جێگەی ژیانە
جێی ژیانی ئینسانە

ئینسان لە هەر رەنگێ بێ
سپی و رەش ، ئی هەموانە

# بێ سەروشوێن

چوار ڕۆژ بەسەرون بوونی "سامڕەند"دا ڕادەبرد . هیچ شوێنێک نەمابوو کەلێی نەگەڕێن . کەس نەیدەزانی بۆ کوێ چووە و چی بەسەر هاتووە ؟ منیش زۆرم پەرۆش بوو . شەو و ڕۆژ ، بێوچان بیرم لێ دەکردەوە تاکوو ئەمڕۆ نامەیەکم پێ گەیشت و شکێکی هەمبوو وەراست گەڕا.

من لە زەمانی منداڵییەوە سامڕەندم دەناسی دەتوانم بڵێم هاوڕێی یەکتر بووین . هەر لە منداڵی یەرە کوڕێکی هێدی و هێمن و لەسەرەخۆ بوو. لە فێرگە و لە ماڵێ هەتا دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوت قەڵەم و کاغەزێکی دەست دەدایە و لە سووچێکی خەریکی وێنەکێشان دەبوو .لەوکاتەوە دیار بوو لە وێنەکێشاندا دەبێتە بلیمەت . باوکی کە بە زەحمەت دەیتوانی بخوێنی و بنووسێ بە ئاواتەوە بوو سامڕەند ببێتە مەلا. بەوهۆیەوە زۆر جاران لەسەر وێنەکێشان بێبەزەیییانە لەگەڵی بەشەڕ دەهات و لێی دەدا و وێنە ـ کانی لێ دەدڕاند . پێی وابوو جارجارە بیراز نەکرێ ناخوێنێ و نابێ بە ئینسان .

سامڕەند بە لێدان وکوتانی باوکی ڕاهاتبوو و حازر نەبوو دەست لە وێنەکێشان هەڵگرێ . خوێندنی سەرەتایی تەواو کرد و بە پێچەوانەی ویستی باوکی نەچوو بۆ حوجرەی فەقێیان و خوێندنی ناوەندی دەست پێ کرد . تا گەورەتر دەبوو لە وێنەکێشاندا کارامەتر دەبوو . کچان بۆ کێشانی وێنە لەسەر دەسرە، بۆ چنین، دەچوونە لای .ورده ورده ناو ـ بانگی هونەروەری دەنگی دایەوە .پێکەوە لە پۆلی چوارەمی ناوەندی دەمانخوێند کە ڕۆژێک لە دوورەوە بە بزەوە بۆلام هات. ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو .کە نزیکم بۆوە گوتم :

ـ چیە ئەمڕۆ زۆر بەکەیفی .

# بێ سەروشوێن

بە پێکەنینەوە وەڵامی دامەوە:

ـ با بڕۆین بۆت دەگێڕمەوە.

ڕێگای بەستێنی چۆممان گرتەبەر. کە لە شار وەدەر کەوتین گوتی:

ـ دەزانی چیە؟ ئەمڕۆ چاوم بە یەکێکی کەوتووە کە شێتی کردووم. تێی نەگەیشتم مەبەستی چیە گوتم:

ـ نازانم دەڵێی چی؟

ـ ئەمڕۆ بەیانی کچێک داوای لێ کردم وێنەی بۆ لەسەر دەسرۆکەیەک بکێشمەوە. ئاخ. خۆزگە دەتدی و دەتزانی چ فریشتەیەکە؟ڕوانینی، بزەی دوانی شێتیان کردووم.

ـ کێ بوو؟

ـ تۆش دەیناسی؛ "ڕۆژین"

ـ ڕۆژین؟

ـ بەڵێ ڕۆژین هەر ئەوکچەی کە سەدان لاو بە ئاواتەوەن جارێکی نیو نیگایەکیان لێ بکا..

ـ دەی؟

ـ دەی چی؟ تۆ بای چت دەکرد؟ دەسرۆکەکەم لێ وەرگرت و بەڵێنیم پێ دا وێنەیەکی جوانی بۆ بکێشمەوە.

بەو جۆرە سامڕەند لەگەڵ ڕۆژین ئاشنا بوو. ئەو ئاشنایی‌یە وردە وردە بووبە ئەوینێکی ئاگرینی‌گیان و لەش‌تاوێن. ئەگەر ڕۆژێ جارێک یەکتریان نەدیبایە ئۆقرەیان لێ هەڵدەگیرا. بەڵام قانوونی تەبیعەتە کە هەر بەهارێک پاییزێکی بە دواوە بێ، بەهاری ئەوینی ئەوانیش دوای دوو ساڵ، کەوتە بەر هێرشی گژەبای جودایی و نەهاتی.

باوکی ڕۆژین بە زۆر کچەکەی لە برازای خۆی مارە کرد و ئەوەی گوێ یان نەدایە هاوار و گریانی ڕۆژین بوو. لە ژیانی کوردەواریدا، ئاوێکە ڕژاوە،کچ هەقی دیاری کردنی چارەنووس و هەڵبژاردنی هاوڕێ و هاوبەشی ژیانی خۆی نیە.

لەو ڕۆژەوە ژیانی سامڕەند گۆڕا. لە هەموو کەس دووری دەکرد. لە سووچێکی‌هۆدەکەیدا خۆی زیندانی کرد بوو و کەمتر وەدەر دەکەوت. وێنەکانی ئیدی دیمەنی جوان و زیندوویان تێدا بەدی نەدەکرا. خەمیان لێ دەباری. لە جیاتی کەوێشکەی گەنم و جۆگەلاڕێزان بوو. دیمەنی خەم تارێنی مێرگ و بژوێن جێگەی خۆی دابوو بە شارێکی چۆڵی تۆز لەسەر نیشتووی خاپوور.. بولبولی ئاشقی سوورە گوڵان ببوو بە کوندەبووی سەر دیوارە رووخاوی لای زەردەپەڕ. کانیاوی سارد و روون، وشک ببوو. شادی و هیوا لە تابلۆکانیدا نەمابووو خەم و ناهومێدی بە سەریاندا زاڵ ببوو..

دایک وباوکی کە دەیانزانی دەردی چیە بۆ ئەوەی کە گوڵچانی پیریان لە دەست نەچێ دوای وت و وێژێک هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە چارەی دەردی سامڕەند ئەمەیە کە ژنێکی بۆ بێنن. پێشنیاریان پێ کرد کە "هەمین"ی کچی مامی لێ مارە کەن. دایک و باوکی چەند ڕۆژێک باسی هەمینیان بۆ کرد و زۆری لەسەر ڕۆیشتن کە دیتیان سامڕەند مل نادا و رازی نابێ باوکی پێی گوت:

ـ ئەگەر کوڕی ئێمەی دەبێ کچی مامت بێنی دەنا، نە تۆ کوڕی ئێمەی نە ئێمە دایک و باوکی تۆین.

سامڕەند بۆ ئەوەی دڵی دایک و باوکی نەشکێنێ زۆر بە نابەدڵی گوتی:

ـ ئێستا کە وایە بۆ خۆتان دەزانن.

زۆر زوو هەمین لە سامڕەند مارە کرا و خێرا گوێزراوە. جار جارە لێم دەپرسی یەوە.

سامڕەند ئەو سامڕەندی چەلان نەبوو. پەیکەرەی خەم و پەژارە بوو . زۆری هەوڵ دەدا کە خۆی لەگەڵ ئەم ژیانەی بەسەری داسەپا بوو ڕێک بخا بەڵام نەیدەتوانی .من زۆرم پەرۆش بوو کەچی چم لە دەست نەدەهات .

دوو ساڵ لەو ژیانە پڕ لە ژانە رادەبرد کە چوار رۆژ لەمەوبەر ، بوو بە قاو کە سامڕەند ون بووە .منیش وەک دایک و باوک و کەس و کاری هیچ شوێنێک نەمابوو کەلێی نەگەڕێم بەڵام بە داخەوە هەروا بێ سەر و شوێن بوو ،تا ئەمڕۆ کە ئەم نامەیەم بە دەست گەیشت . زانیم نامەی سامڕەندە بەپەلە کردمەوە و خێرا دەستم بە خوێندنەوەی کرد . نووسیبووی :

" هاوڕێی خۆشەویستم !

لێم ببوورە کە بێ ماڵ ئاوایی تۆم بە جێ هێشت.هۆی ئەو کارەش ئەمە بوو کە دەمزانی ئەگەر پێت بڵێم دەڕۆم و نایەمەوە ، دەڕۆم و وەدوای چارەنووسم دەکەوم بەرگریم لێ دەکەی بۆیە بێ خەبەر ڕۆیشتم .

نازانم رۆیینی منت بەلاوە سەیرە یا نا ؟ دیارە تۆ تاقە هاوڕێی ژیانمی بەڵام شارەزای دەردەکانم نی . دوای لە دەست چوونی رۆژین ــ کە تا دەمرم لە بیری ناکەم ــ شادی و خۆشی لە ژیانمدا نەما. کەوتمە گێژاوی خەم وجەخارەوە. تازە دەهاتم ئۆگری ژیانی تازەم بم کە دایک و باوکم ناچاریان کردم لەگەڵ هەمینی کچی مامم کە هیچ دڵم بۆی نەدەچوو رابوێرم . هەرچەند دەمزانی بەیەکەوە بەختەوەر نابین دڵم نەشکاندن تازە دوو رۆژ بوو کە هەمینم گوێستبۆوە بۆ ئەوەی کە بە ژیانی دوا رۆژمان دڵگەرم بێ یەکێک لە جوانترین تابلۆکانم کە دەیان شەو و رۆژ کارم لەسەر کردبوو ، دایە و گوتم :

ــ هەمین گیان! ئەم تابلۆیە پێشکەشە بە تۆ .

زۆر بە ساردی لێی وەرگرتم . بێ سپاس کردن گوتی :

ــ چی لێ بکەم ؟!

ــ ئەمە جوانترین تابلۆیە کە کێشاومە . بە تۆی پێشکەش دەکەم . تابلۆکەی بەبێ وازی لەسەر تاقە دانا و گوتی :

ــ جا من بۆ چیمە ...؟!

دەتگوت دنیایان بەسەرمدا وێران کرد . سەرم سووڕمابوو ئینسانیش ئەوەندە بێ زەوق و بێ هەست و تێ نەگەیشتوو دەبێ ؟ وەرووی خۆم نەهێنا و گوتم :قەیدی نیە وردە وردە هونەری پێ دەناسێنم . دەیهێنمە سەر رێگا . کەچی بەداخەوە لە دوو ساڵی رابردوودا هەرچی باسی هونەرم بۆ دەکرد هەر تەقەی لەسەری دەهات و بەبێوازییەوە قسەکەی دەگۆڕی .زۆر لێک دوور بووین. گڵی من بە ئاوی هونەر گیرابۆوە .هەموو شتێکی جوانم خۆش دەویست . موسیقای دڵنشین مەستی دەکردم .پارچە شیعرێکی جوان دەیبردمە دنیای خەیاڵەوە. بەڵام هەمین .... هەر پێی خۆش بوو دانیشێ مستێک تۆو گوڵە بەرۆژە لە پێش خۆی هەڵرێژێ و غەیبەتی خەڵکی بکا کە فڵانە ژن وای گوت ..فیسارە ژن وای کرد. . کاتێک تۆو گوڵە بەرۆژەش تەواو دەبوو زارجوو بنێشتێکی لە زاری دەنا و ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو . ناچار بووم دەست لە هونەرەکەم بشۆم .رەنگە بزانێ ئەوە بۆ من چ دەردێکی گەورە و گرانە. دوو حەوتوو لەمەوبەر پێی چەقاند و گوتی :

ــ دەچمە ماڵە باوکم .

ساز بووین و بەرەو ماڵە باوکی کە لە شاری " س" ە وەڕێ کەوتین . لە رێگا دا دیمەنی چیا و مێرگ و بژوێن و بە تێرامانی سۆڵاو و چۆم و ئەستێر ، بەڕاستی خەم رەوێن بوو . خۆم پێ رانەگیرا گوتم :

ــ بڕوانە ئەو دیمەنانە چەند جوان و دلرفێنن ..

لووتی هەڵقڕچاند و گوتی:

ل ٨٣ ←

# وێنەگەرێکی مەزنی کورد بناسین

**من سەبک ناناسم . لە تەبیعەتی جوانی نیشتمانەکەم ئیلهام وەردەگرم .**

هاوینە ! دار و دەوەن لەبەرتین و تەوژمی بێ ئامانی خۆر وەزاڵە هاتووە .توونیمە ! دەمەوێ دەراوێکی روون پەیدا کەم و هێندێک لێی بحەسێمەوە ،

نازانم چۆنە کە لە خۆڕا وەبیری بەهارێ کەوتوومەوە . بەهارێکی خۆش و سەرسەوز . دیلان و گۆوەند دەبینم . راو و شکار دەبینم . بڵێی بۆ راست لەم کاتەدا ئەوەم وەبیرم هاتۆتەوە ؟

وەبیرم هاتەوە . لە سەقزم لە سەقزی خنجیلانە .سەرەڕای ئەوە کە لەم شارە لە دایک نەبووم بەڵام هەست بە نامۆیی ناکەم . مامۆستایەک هەیە تاڵ و سوێری زۆر چێشتووە . تەمەنێکی رابواردوو ە . دەستەکانی ئاسەواری پیری یان لێ بەدی دەکرێ . هەر ئەو دەستانەی یاریدەی خۆڕسکیان داوە و یارمەتی‌یان لێ وەرگرتووە .

بەڵێ نەققاشە .ماڵەکەی چوار فەسڵە . لە لایەک زستانە و راوی سەر بەفر . لایەکی دی بەهارێکی پێدەشتی‌کوردەواری‌یە لە لایەک زەماوەندە و بووک دەگوێزنەوە . هێدی و لەسەرەخۆ لاقی هاویشتۆتە سەر لاقی و تێ یان راماوە .دەچمە پێشتر ! سڵاوی لێدەکەم .وەک چاوەڕوان نەبێ وایە . لێم دەڕوانێ . وەڵامم دەداتەوە . بەڵام من ئەوانەم ناوێ . دەمەوێ بیناسێنم . هێندیک دەنگم بەرزتر دەکەمەوە . وادیارە حاڵی نەبووە . بۆیە هەر سەری رادەوەشێنێ .سەر لە نوێ دووپاتی دەکەمەوە .مامۆستا گیان، تکایە روونتر خۆت بناسێنە .

**ـ من (فیض اللە) ناهیدم .**

زۆر بە ساکاری وەک هیچ کارێکی نەکردبێ وایە . ئاهەنگی نزم و بەرزی کەلامی وام بەسەر دێنی کە هەموو لەش بکەم بە گوێ .لە هەناسەکەم تووڕەم کە بەر هەڵستی بیستنی دەنگە .هەناسەیەک هەڵدەکێشی و ئەمجار دیسان مات و بێدەنگ چاو لە پەنجەرە

دەبڕێ ، پێم خۆشە وەقسەی بێنم. هەستی پیرانەی بجوولێنم . لێی دەپرسم :

ـ تەمەنت چەندە؟ چ ماوەیەکە خەریکی هونەری نەقاشی ؟

**ـ تەمەنم هەشتا و پێنج ساڵە .نزیک بە شەست ساڵە نەقاشی دەکەم .شەست جار وەرزە جۆربەجۆرەکانم دیوە ئەزموونی من ئەوانەن .**

دەستی بۆ تابلۆکان راداشت. جارێ نەمدەتوانی چاوی لەسەر هەڵ بگرم . پێم خۆشە قسان بکا ،دەیدوێنم. پاش وەی هێندێک لە تابلۆکان راماگوتی:

**ـ من هەر بۆخوم فێر بووم مامۆستا یەکم نەبوو دەستم بگرێ.هەرچی دەیزانم لە هەست و گوڕ و زەوقی خۆمەوە.**

ـ مامۆستا چ رێبازێکت لە نەقاشیدا گرتۆتە بەر؟

**ـ من نازانم مەبەستت چیە؟ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە کە چ سەبکێکم گرتۆتە بەر دەبێ بڵێم من سەبک نانا سم. لە تەبیعەتی جوانی نیشتمانەکەم ئیلهام وەردەگرم**

هەناسەیەکی هەڵکێشا ئەمجار سەری بەرز کردەوە .

**ـ ئەودەم کە هەرەتم بوو بە دۆڵ و شاخی کوردستاندا دەکەڕا م .چاوەکانم وەک ئێستا پرووش و بێ سۆ نەبوون . هەنگاوەکانم پتەو بوو . قەت شل نەدەبووم ، نەدەوەستا م، وەختی خۆی راویشم دەکرد . ئەمانە هەمووی دەستیان دابوو بە یەک تا ئەم هەستەم پاراو کەن و بتوانم ئەوەی دەیبینم بیکێشمەوە .سەرەڕا ی ئەوەش من بۆ خۆم جووتێرم چاو لێکە تابلۆکانم هەموو بۆن و بەرامە و چێژی لادێیان هەیە .**

ـ ئێستاش هەر وەرزێرن ؟ مەبەستم ئەوەیە کە بە کشت و کاڵ بەرێ دەچن؟ چاوێکم لێدەکا . هێندیک دەروانێتە قەڵەم و دەفتەرەکەم دوایە دەڵێ :

**ـ من وەرزێر بووم .بەڵێ زەمانێک بەوە بەرێ دەچووم بە پێچەوانەی هێندێکان قەتم نەویستووە هونەر لەگەڵ**

گەوهەر بگۆڕمەوە. ئێستا ماوەیەکە دەرسی نەقاشی بە منداڵان دەڵێم. مانگێ ١٧٠٠ تمەنیشم پووڵ دەدەنێ. خودا بیانپارێزی لەگەڵ هەموو کوڕەباشەکان، بەڕاستی ئەگەر کوڕەکانم بە هانامەوە نەیەن بە خۆم و شەش کەسەوە ناتوانم رایبوێرم.

ماموستا هیوادارم بە ساخی و خۆشی بژی. پرسیارێکم ماوە ئەویش ئەوەیە کە تابلۆکانت خەیاڵین یا راستە و خۆ لە تەبیعەتت وەرگرتوون؟

**- رۆڵە زەمانێک بوو پێم گوڕی بوو، چاوم سۆمایی بوو، دەستم هێزی بوو، ئەودەم تابلۆکانم بۆنی راستییان لێدەهات. چون بەرەو ئێلاخ و کوێستان و چڕو زەبەند و هەڵدێر و رژدان دەچووم و وێنەم لێ- هەڵدەگرتەوە بەڵام ئێستا سەردەمی ئاویلکەمە و تابلۆکانم تۆز و گەردی خەیاڵیان لێ نیشتووە.**

- پێت خۆشە بەرەو ئاوایی بڕۆیەوە؟

**- جا چۆن پێم خۆش نیە. من بە ئاو و هەوای کوێستان گووراوم. ژیانم لە دێیە. زەوی و زارەکەشم هەر لەوێیە**

زانیم ماندوو بووە. زۆرم وەڕەز کردووە. دەمویست قسەیەکی دیکەی لێ بپرسم و دوایە ماڵ ئاوایی لێ بخوازم. هەر بۆیە:

- ماموستا چ پەیامێکتان بۆ هونەرمەندان بە تایبەت هومەرمەندانی کوردستان هەیە؟

**- هونەرمەندی بەڕاستی ئەو کەسەیە بەرچاو تەنگ نەبێ. بەرهەمی کاری خۆی بنێرێتە بەر نەزەری خەڵک. ئەوەی دەیزانێ فێری خەڵکیشی بکا.**

دیتم .زۆر جوان ناسیم. لەگەڵی ئاشنا بووم. بەڵام ئێستاش هەرکاسم وڵامی زۆر پرسیاری دیکەم ماوە کە لەبەر پیری و بێتاقەتی ماموستا هەڵیان دەگرم بۆ سەفەرێکی دیکە .ئەگەر رێگام لەم لایە کەوت بە خزمەتی دەگەمەوە.

مانگی خەرمانان بۆ جووتێری کورد، مانگی بەرەکەت و رەحمەتە وەک لە نێوەکەی دەردەکەوێ مانگی هەڵگرتنی حاسڵات و خەڵە و خەرمان و کۆکردنەوەی دەسڕەنجی چەند مانگی بەهار و هاوین و خۆ ئامادە کردن بۆ پایزە. مانگی کێڵ و داخستنی زمهەڕی زستانێیە. مانگی خەرمانان لە کوردستاند شاهیدی هەڵدرانەوەی بە دەیان هەزار کۆگای سپی و زەرد و قاوەیی بە نێوی خەرمانە، لە لایەک سوور شەقڵ کراوە و لە لایەک کای سپی چاوەڕوانی رەشکە و چەتانە. هەتا بخزێتە نێو کادێنان و تفاقی مەڕ و ماڵاتی لە زستاندا دابین بکرێ، لە لایەک کوێزرە و چاوەڕوانی کەو و باڵە کەوە، کاری خودایە و زۆریش جوانە.

بەڵام ئەو سوورەی شەقڵ کراوە خۆی وەبیر هێنەرەوەی ژیانێکی درێژ خایەن و لە مێژینەی کوردی چەوساوەی حەق خوراوە، لە درێژایی مێژووی پڕ لە کارەساتیدا، دەنک دەنکی ئەو گەنمە سوورە جوانە جاچ گەنمە مەلابێ چ پەڕشی و گوڵ رووت، سمەوەج بێ یا سەرداری، بە هارووبێ یا پایزە یا گەنمە شووشە بەسەرهاتێکی هەیە، کە دەگەڕێتەوە سەر دەیان و سەدان و هەزاران ساڵ وەک نەقڵی نەنک و باپیران لە بن کورسی زستاناندا گەرمی بەخشی ژیانی پڕ لە کلۆڵیمانە، ئەو ژیانەی کە سەردەمێک مانگ و رۆژمان دەپەرست، یا ئاورمان هەڵدە کرد و باز بازدێنمان لەسەر دەکرد و یا ئاورگەمان ساڵ دوازدەی مانگێ دایسا. یا ئەو رۆژگارەی خۆرەتاوی ئیسلامی

محەممەدی گزینگی هاوێشتە سەر چیای ژیانمان .

ئەو دەمەی کە شوان بووین و گاوانیمان دەکرد ، ئەو چەرخەی کە گاوجووتمان وەپێش خۆ دا و زەویمان کێڵا یا ئەو

ڕۆژەی کە بە کزی و ماتی و چاوی بە مۆلەق وەستاو و بە دەستی بەتاڵ ڕوانیمانە سەر دونیای هاژاوی پێشکەوتووی سەنعەتی و لەباتی حەسانەوە لەبەر بەروبووی لە نێو ڕەشە دووکەڵەکەیدا خنکاین .

دەنک دەنکی ئەو گەنمە جوانە بێپسانەوە حیکایەتمان بۆ دەکەن ، حیکایەتی سەیر سەیر نەک هەر مەڕۆکە و بزنۆکە یا قالۆنچەی پیوازی و دێوی سپی و ڕەش ،بەڵکوو حیکایەتی ئەو سەودایانەی لەسەریان کردین جا چ لە ڕۆژهەڵات و چ لە ڕۆژئاوادا ،چ لە چەپ و چ لە ڕاست ، لە هەموو لایەک و لە هەموو شوێنێک ، ڕۆژێک ڕووس هات ، ڕۆژێک ئەلمان ، ڕۆژێک ئینگلیس هات و دوێنێ ئەمریکا ،"ئای لەوێ زوڵمێ لەوێ غەدرێ" •ڕۆژێک لە بەرگی پیاو چاکاندا بۆمان موراقیب بوون وە ڕۆژێکی تاڵ و تفت و پڕ لە بۆکەن کردیانە ڕەعیەتی ئاغای، ئەو گەنمە جوانە ، دەنک دەنکی ئەو گەنمە جوانە حیکایەتمان بۆ دەکەن، حیکایەتی مەڕانە و سوورانە و سەرانە و مریشکانە و تەپاڵانە و کەمرانە و دەیانی دیکە ، دە و دوومان قەت لە بیر ناچێتەوە و برینی چڵک کردووی بێگاری ڕەنگەبەو زوانە لەسەر شانمان پاک نەبێتەوە ،.

بەڵام ڕاوەستاین ، پیمان چەقاند و ویستمان لەسەر مانەوە بوو، بەردی تیژ ڕاستە سەر و گوێلاکی شکاندین بەڵام پشتی نەچەماندینەوە ، زەوی ڕەق و بەیار وبەرەڵانمان زۆر کێڵاو نەوەستاین ، هاڕە هاڕ و گرمە گرمی سەنعەتیش ڕای نەچڵەکاندین ، بەڵام شنە بای فێنکی ئیسلام و قورئان ئارەقەی لەشی بۆ کردینەوە هەڵم و بە قالبێکی سووک خەریکی داڕشتنی بناغەی ژیانی داهاتوومان بووین ،ئەو ژیانەی کە دوایین قۆناغی ڕەشی سەردەمی دەرەبەگایەتی بوو. ڕاستە لەو دەمیدا هەرچی هەمان بوو ی ئاغای بوو بەڵام خودامان بە ی خۆمان دەزانی و پشت و پەنا هەر ئەو بوو .ئاغا دەهات سووری لێ شەقڵ دەکردین و لەسەر پێوانەکەی ڕادەوەستا بەڵام نێوی خودامان دەگوێی دەسریواند و کیلە بە کیلە ، مست بە مست نێومان دەهێنا. ئەوا لێرەدا لە زمانی چەند جووتێری کوردی خۆماڵی خەلە و خەرمانمان دەپێوین ، لەم نووسراوەدا حەولم داوە هەر چی شاهید و جووتێر کوتوویەتی بینووسمەوە و دەستی تێ وەر نەدەم بۆ ئەوەی پاک و پاڵێو راو و ڕەسەن بێ، باسی خەرمان پێوانم لە زمان دوو کەسەوە نووسیوەتەوە هەتا ئەگەر جیاوازیەک هەبێ لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستاندا هەتا ئەوەندەی بۆم دەگونجێ ڕوونی کەمەوە ،جیاوازیەکەشی بە ڕوونی دەرکەوتووە هەر وەکی خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەیاندا بۆی دەردەکەوێ .

وێژەر : کاک سەعیدی جەهانگیری
خەڵکی دەرمان ، مەحاڵی ئاختەچی

یەک : خودا یەکە و دوو نیەکەس لەڕەنگی ئەو نیە .

دوو : بیکەینە توو بە ئیزنی تووخودایە

سێ : بەرەکەتی ئایەت و حەدیسێ دەو کۆگایە بڕەخسێ .

چوار : بەرەکەتی هەر چوار یاری دەنەبی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی

پێنج : بەرەکەتی هەر پێنج فەرزان گەنم و جۆ ببێ هەرزان .

شەش : بە شەشەکەی حاجیان بە هیممەتی غەزاییان .

حەوت : یا مەلەکەلمەوت، بەرەکەتی حوت تەبەقەی عەرز و عاسمانێ تێکەوت .

هەشت : قاپیەی بەهەشت نوور لە ئیلاهی بوو بە گەشت یا ئەڵڵا .

نۆ : نۆی نەبی بە زیاد بی بە کەم نەبی ،بە زیادە خێرێ بێ بۆ خاتری محەممەدی نەبی . (۱)

دە : دەهەزار سڵاوەت بێ لە پێغەمبەری .

یازدە : یازدە پسەرانی حەزرەتی یاقووب بە غەیری حەزرەتی یوسف .

دوازدە : بەرەکەتی هەر دوازدە ئیمامی دەشتی بەغدایەت تێ کەوی .

زیادە : زیاد دەبی رسقی ئوممەتی دینی ئیسلامێ .

چاردە : چاردە مەخسودێکی پاکە لە خزمەت خودای بێباکە (۲)

پازدە : نیوەی حیسابێ ( ۳ )

شازدە : یا خودای رۆزی دەهندە

حەڤدە : خەبەرێکی خۆش دەدا

هەژدە : کەمبەر بەستی شاهی مەردان

نۆزدە : نوونە ،کافیروونە لە خزمەت خودای مەحزوونە

بیست : یا حەزرەتی شیست یا محەممەدی خۆشەویست .

---

( ۱ )= نۆی نەبی : بە قسەی مامۆستا مەلا رەشیدی قەرەنی زادە رۆژی نۆهەمی مانگی قوربانە و رۆژی عەرەفەیە و رۆژێکی موبارەکە و پێش جێژنی قوربانێیە. رەنگە مەبەست لە نەبی حەزرەتی ئیبراهیم بووبێ .

( ۲ ) مەعسوومیکی پاکە ، لە زمانی عەوام دا بۆتە مەخسوود.

( ۳ ) حیساب کە دەگەیشتە بیست داڵیە یان لێدەدا . یانی سەرکار دارێکی بە دەستەوە بوو کە دەگەیشتە بیست لەلەیەکی لێدادەبڕی وسەر لە نوێ لە یەکەوە حیساب دەکرا . پازدە نیوەی حیسابێ بە بڕوای ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە کە داڵیە لەسی لێ دەدرا.

وێژەر : کاک قادری ئازەند، خەڵکی سلۆک، ناوچەی مەنگوڕان ●

یەک : خودا یەکە و دوو نیە کەس لە رەنگی وی نیە .

دوو : خودایە بە ئیزنی توو .

سێ : بەرەکەتی ئایات و حەدیسێ لەو کۆگایە بڕەخسێ .

چوار : بەرەکەتی هەر چوار یاری نەبی ، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی

پێنج : بەرەکەتی هەرپێنج فەرزان ، گەنم و جۆی بکەی هەرزان انشاء الله یا رەحمان .

شەش : بە شەشەکەی حاجیان بە ئومێدی غەزاییان .

حەوت : یا مەلەکەلمەوت بەرەکەت دەو کۆگایەی کەوت .

هەشت : قاپی بەهەشت نووری ئیلاهی بوو بە گەشت .

نۆ : نۆی نەبی ، بە کەم نەبی بە زیادەی خێرێ بی بە نسیبی ساحێبت بی .

دە : دەهەزار سڵاوات لە پێغەمبەری

یازدە : یازدە پسەرانی حەزرەتی یەعقووب (یاقوب) بەغەیری یوسف، یا " یازدە پسرانی حەزرەتی یاقوب با یوسف "

دوازدە : یا دوازدە ئیمامانی دەشتی بەغدایە .

زیادە : زیاد بێ دینی محەممەدی دەگەڵ رسقی ئۆممەتێ

چاردە : مەقسوودێکی پاکە لەکن خودای بێ باکە .

پازدە : نیوەی حیسابێ

شازدە : دوبارە پازدە .

حەڤدە : کەمبەر بەندی شاهی مەردان یا عەلی

هەژدە : خەبەرێکی خۆش بدە .

نۆزدە : "نون والقلم و ما یسطرون" .

بیست : بیست هەزار سڵاوات لە دیداری پاکی پێغەمبەری .

---

**روون کردنەوە :**

● ئەمن بۆخۆم ئەو بژاردنەم لە کاک قادری وەر نەگرتووە بەڵکوو بۆیان نووسیومەوە و بۆیان هێناوم و ئەوکەسەش کە نووسیویەتەوە نازانێ خەتتی کوردی جوان بنووسێ هەر لەبەر ئەوە لە چەند جێگایان ئەو وشانەی پێم هەڵە بوون ، بە پێی بۆ چوونی خۆم و پێوانەکانی دیکە راستم کردوونەوە.

# ئێمە و خوێنەر

بۆکان :کاک ئەحمەدی- مەجدی

✡ پێشنیارە جوانەکانت گەیشت. بە هیوای خودا لە ژمارەکانی داهاتوودا تا ئەو جێگایەی بۆمان بگونجێ لەبەر چاویان دەگرین.

بۆکان :کاک سەید- ڕەسوولی سید قادری

✡ لەم هەموو لوتفەت زۆر سپاس دەکەین و هیوادارین هەر وەکی بۆ خۆت نووسیوتە بتوانین خزمەتێکی بەرچاو بە فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوەکەمان بکەین و هەموو لایەک رازی بکەین.

سەقز : کاک عومەری - فارووقی

✡ نامە و شیعرەکانت گەیشتن. پێشنیارە جوانەکانت لەبەر چاو دەگرین .بە هیوای خودا لە ژمارەکانی داهاتووی سروەشدا لەو شیعرانەت کە لەگەڵ ڕێبازی سروە یەک بگرنەوە کەلک وەردەگرین. چاوەڕوانی بەرهەمی تازەتری ئێوەین.

کەرەج :کاک فەرهاد- پیربال

✡ نامەکەت گەیشت.پێشنیارە جوانەکانت وەبەر چاو دەگرین. چاوەروانی بەرهەمی تازەتری ئێوەی ئازیزین.

مهاباد : کاک کەریم- ڕەسوولپوور

✡ برای بەرێز بەداخەوە فەرهەنگێکی کوردی - فارسی وامان نیە کە بە ئێوەی بناسێنین. ئەوانەی هەن زوربەیان کەم وکووڕیەکی یەکجار زۆریان هەیە و سەر لە پیاوی دەشێوێنن، بەو هیوایەی زانایانی وڵاتەکەمان لەبیری کارێکی وەها گرینگ و پڕبایەخدا بن.

نقدە : کاک بازید- ڕەشیدی

✡ کاکە گیان نووسین و خوێندنەوەی کتێب و نووسراوەی کوردی دەتوانێ یاریدەتان بدا، هیوادارین ئەم گۆوارەش تا ڕادەیەکی زۆر ئەم گیر و گرفتەی ئێوە چارەسەر بکا. سەرکەوتووبی.

تاران :ماموٚستا سەدیقی بۆرەکەیی

✡ دیاریە بە نرخەکەت گەیشت. ئەم شیعرەی بە ناوی فۆلکلۆر بۆت ناردووین،هی شاعیرێکی پایەبەرزە بە ناوی میرزا شەفیع. جا کە وابوو شیعرێکی شاعیرەکەی ناسراوبێ، فۆلکلۆر نیە. بەو هیوایەی مەبەستی جوانترمان بۆ بنێرن.

سنە : کاک محمد صدیق- زمانەپور

✡ سوپاسی هەستە جوانەکەت دەکەین. پێشنیارەکانت لەبەر چاو دەگرین .هیوادارین خەتی سروەی ژمارە دوو ئێوەی رازی کردبێ.

مەریوان : کاک حسن - کبری

✡ لە ژمارەکانی داهاتوودا باسی وەلی دێوانە دەکەین. هیوادارین بتوانین رەزامەندی ئێوە و هەموو خوێنەران پێک بێنین.

مەهاباد: کاک سەید- ئیسماعیلی عەلیپوور

✡ نامە جوانەکەت گەیشت. هەستی خاوێنی خوێنەرانی وەک تۆ لەم کارە فەرهەنگیەدا زیاتر هانمان دەدا.

بروجرد :کاک فەرهادی - قازی

✡ دیاریە جوانەکەت گەیشت. بە هیواین لە ژمارەکانی داهاتوودا کەلکی لێ وەربگرین.

سنە :کاک عەلی شوکری

✡ نامە و شیعرە جوانەکانت گەیشتن .چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەین.

سنە : مامۆستا سەید هاشمی هیدایەتی

✫ ئێمەش هیوادارین بتوانین بۆ جوبرانی رابردوو هەرچی زیاتر خزمەت بە زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بکەین .جگە لەوەش مەبەستێکی دیکەمان نیە .جیاوازی کاری ئێمە و کۆڕی زانیاری کورد لە عێراق کە ئێستا ناوەکەشی گۆڕاوە ئەوەیە کە ئێمە دەمانەوێ سەرەڕای رێزدانان بۆ هەموو لەهجەوبن لەهجەکان بۆ پێک هێنانی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی تێبکۆشین ، کە بەداخەوە ئەو هەلە بۆ وان نەدەڕەخسا .

سەقز : کاک مستەفای حوسێن پور

✫ بەداخەوە نەتانووسیوە ئەم شیعرە هی چ شاعیرێکە و لەبەر خاتری ئەمەکە ناوی بەسەرەوە نەبوو نەمانتوانی کەلکی لی وەربگرین .

کەرەج : کاک شەماڵ جودایی

✫ نامە و شیعرەکەت گەیشت. سپاست دەکەین .بە هاورێی سروەت دەناسین . بەڵام شیعرەکەت لە چوارچێوەی سروەدا ناگونجێ.چاوەڕوانی بەرهەمی جوانتری ئێوەین.

مەهاباد :کاک رەحمانی حاجی

✫ سپاسی هەستی خاوێنت دەکەین . لە دیاریەکەت کەلک وەردەگرین .

سنە :کاک سالک

✫ شیعرەکەتان کەم هێزە بەڵام بە متالای پتر دەتوانن شاعیرێکی باش بن .

بۆکان : کاک عەلی پەناهی

✫ ئەمجار دەتوانی شیعرەکانت بۆ سروە بەرێ بکەی هەتا رێنوێنیت بکەین .پێشنیارەکانیشت زۆر بەجێ بوون و ئەگەر بۆمان بلوێ لە داهاتوودا لەبەر چاوی دەگرین .

خوێنەری بەڕێز...نیگار

✫ دیاریە جوانەکەت گەیشت . حەیف!! ناتوانین بڵاوی بکەینەوە. چون ناو و نیشانی خۆت نەنووسیوە. لێرەدا جێی خۆیەتی لە تەواوی ئەو خوشک وبرایانەی نامەمان بۆ دەنێرن داوا بکەین کە ناوونیشانی خۆیان بنووسن جا ئەگەر پێیان خۆش نیە ناویان بڵاو بێتەوە ئاگادارمان کەن .چون هەر نامەیەکی ناوی نووسەرەکەی تێدا نەبێ چاپ ناکرێ .

---

✿ لە وەڵامی کاک سەدیقی ئەحمەدی و بەشێکی دیکە لە خوێنەرانی سروەدا کە بە ناردنی نامە و سەردان لە دەستەی نووسەرانی سروە رایانگەیاندووە ئێستا کە دەستمان قەڵەم ناگرێ ئایا دەتوانین بە ناردنی یارمەتی مالی بەشێک لەم ئەرکە گرینگە فەرهەنگیە بە ئەستۆ بگرین رادەگەیەنین ئێمە هەر لە سەرەتای کارەوە پشتمان بە یارمەتی خودا و هاوکاری زانایان و ئەدەبدۆستانی کورد بەستووە و لە راستیشدا ئەگەر خودای مەزن یارمەتی نەدابایەن و ئەدەبدۆستانی کورد بە ناردنی نووسراوەی بە کەلک بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشێکی ماددی بووبن بە هانامانەوە نەهاتبان نەماندەتوانی کارێکی وا گرینگ وە ئەستۆ بگرین . دیسانیش تەوەککولمان بە خودایە و داوای یاریدە لە ئێوە دەکەین ، بە هەر شێوەیەک بۆتان دەگونجێ بە هانامانەوە بێن وەک هاتوون . پەرەگرتن یا نەگرتنی کارەکەمان بە رادەی یاریدەی مادی و مەعنەوی ئێوە بەستراوەتەوە .سپاسی هەمووتان دەکەین . بەراستی تەنیا بڵاوکردنەوەی ئەو نامانەی بۆ هان دانی ئێمە بە دەستمان گەیشتووە بۆ خۆی نیازی بە گۆوار یا کتێبێک هەیە چ دەگا بەو نووسراوانەی بۆیان ناردووین. ئێمە تەنیا بەشێک لە هەر نامەیەکمان بڵاو کردۆتەوە ، ئەویش ئەوەندەمان ورد لە چاپ داون کە خوێندنەوەیان زەحمەتە . هێشتا لە بەشێکی زۆرتر چاوپۆشیمان کردووە کە داوای لێبووردنیان لێ دەکەین .

# ڕێنوێنی ئەدەبی

**بۆکان :کاک مستەفا - ئێلخانی زادە**

☆ سپاسی ئەو هەستە جوانەت دەکەین . بە بڕوای ئێمە باسێکی باشتان هێناوەتە گۆڕێ بەڵام پێویستی بە موتالایەکی بەربڵاوتر هەیە و ئەم باسە لک و پۆپی زۆر لێدەبێتەوە کە دەبێ هەموویان بناسێنین .

**شنۆ :کاک مستەفا ڕەسوولی**

☆جێگای خوشحاڵی ئێمەیە کە گۆوارەکەمان هانی داوی دەست بدەیتە قەڵەم و بنووسی. هەرچەند بە قسەی خۆت ئەمە یەکەم جارە شت دەنووسی، بەڵام لەباری ئەدەبیەوە جوان و دڵگر بوو تەنیا ڕەخنەمان ئەوەیە کە زۆری ناهومێدی تێدا بوو ، بۆ خۆت جێگای هومێدی ئێمەی هیوادارین نووسراوەکانیشت پڕ لە هیوا و هومێد بن .

**بۆکان :کاک محمدامین- شامحمدی**

☆ئەگەر پتر هەوڵ بدەن و موتالا بکەن شیعرەکانتان زۆر لەمە جوانتر دەبن . شیعر تەنیا وەزن و قافیە نیە ، بەڵکوو نێوەرۆکی جوان لە هەر قالبێک دابێ شەرتی بنەڕەتی شیعرە .

**تەورێز : کاک عومەری - حیسامی**

☆شیعرەکانت بێهێزن. بەڵام هیوای ئەوەمان هەیە کە ئەگەر پتر خۆ ماندوو بکەی بتوانی شیعری بە پێزتر دابنێی و لەو ڕێگایەوە خزمەت بە گەل و کۆمەڵ بکەی .

**سەردەشت : کاک ابراهیم ب**

☆ نامەکەتمان پێ گەیشت . ئەگەر پتر هەوڵ بدەی دەتوانی شیعری زۆر جوانتر بڵێی.

**تاران :کاک کامەران - کوێستانی**

☆شیعری نوێش نیازی بە ئاهەنگ و مووسیقا هەیە. بەداخەوە شیعرەکانت ئاهەنگیان نیە. ئێمە لەو بڕوایەداین لەسەر پەخشان کار بکەی پتر پێش دەکەوی.

**تاران : کاک محمد - قهوەای**

☆ نامە و شیعرەکانت گەیشتن. دەستەی نووسەران لای وایە کە ئێوە هەستی شیعریتان هەیە و دەتوانن بە موتالایەکی بەربڵاوتر شیعری جوانتر بڵێن . بو ئەو کارە دەتوانن دیوانی شاعیرەکان بخوێننەوە

**سەقز :کاک عبدا ... کریمی**

☆ چیرۆکەکەتمان خوێندەوە. وەسفەکانی ناحەز نەبوون بەڵام تو پێت وایە ئەوەی نەتدیوە لەوەی دیتووتە جوانتری دەنووسی.کاکە گیان ئەم چەشنە سووژانە کۆن بوون و تۆ دەتوانی بە ڕوانینێکی ئەدیبانە لە دەور و بەری خۆت سووژەی جوانتر پەیدا بکەی.بەتایبەتی کە واوێ دەچێ لە کاروباری ئاواییدا شارەزاش بی. لە لایەکی دیکەوە شوێنی ژینی قارەمانەکانت یەکتر ناگرنەوە بۆ وەی پتر لەم بارەوە شارەزا بی دەتوانی لەو کتێبانەی کە لەسەر هونەری چیرۆک نووسی نووسراون کەلک وەربگری .

☆ **بۆکان : کاک نادری - مستەفا زادە**

تۆ ئیستیعدادت هەیە، بەڵام وادیارە ناتەوی کەلکی لێ وەربگری. ئێمە بەرەوڕوو ڕێنوێنیمان کردی ، ئێستاش داوات لێ دەکەین چیرۆکی منداڵانەی وامان بۆ بنێرە کە لە زمانی پیرێژن و پیرەپیاوەکانی گوندەکەی خۆت بیستبێ.بە موتالایەکی زیاتری چیرۆکە نووسراوەکان و ئەو کتێبانەی لەسەر ئوسوولی چیرۆک نووسین نووسراون دەتوانی بۆ خوێشت چیرۆک بنووسی .

◄ **پاشماوەی بێ سەر و...**

ـ بە زیادم نەکرد .. ئەو ئاو و بەردە کوێی جوانە . ؟ دیسان ددانم بە جەرگی خۆم داگرت و دەنگم نەکرد . دوو حەوتوو لە ماڵە باوکی مایەوە دەرفەتێکم بۆ هەڵکەوتبوو تا وێنەیەکی کە لە مێشکمدا بوو، بکێشمەوە کچە کوردێک کە لە هەوار خەریکی مەشکە ژاندن بوو .. بەڕاستی جوانم کێشابووە . بۆ خۆم لێی رازی بووم ژیانی کوردەواری هەمیشە ئیلهام بەخشی ئاسەواری هونەری منە . تابلۆکە تەواوببوو کە هەمین گەڕایەوە . دوای بەخێرهێنان تابلۆکەم پێشان دا و گوتم:

ـ جوانە ؟

لێی وەرگرتم و چەقۆیەکی دەستدایە و یەک و دووی لێ نەکرد و دڕبەدڕی کرد و گوتی:

ـ نۆرەی ئەوەیە وێنەی کچەتیوانم بۆ بکێشی یەوە؟

دەتگوت چەقۆکەی لە دڵ و گیانی من رۆکرد دنیا لەبە پێش چاوم تاریک بوو .هەستم کرد لە ماڵە خۆم داغەریبم . دوو تنۆک فرمێسک لە چاوانم هاتنە خوار . زانیم ئیدی ئەو ماڵە جێگای من نیە . وەدەرکەوتم و سەری خۆم هەڵگرت و رۆییم؟ بۆ کوێ؟ بۆ خۆشم نازانم .ئەوەندەی دەزانم هونەر گیانی منە ، ژیانی منە، بێ هونەر تەنانەت تاوێک ناژیم. دەڕۆم تا دەگەمە جێگەیەک کە هونەر بایەخی بێ .

رەنگە لۆمەم بکەی بۆ لێک جیا نەبووینەوە و سەری خۆم هەڵگرتووە ؟ ئاخر باوکم ...باوکم دەست و پێی بەستبووم .چەند جاران پێم گوتبوو کە لەگەڵ هەمین رابواردنمان نابێ هەموو جارێ سەرکۆنەی دەکردم :

ـ رۆڵە! جا چۆن کچی کاکم تەلاق دەدەی و بە سەری دادەیەوە ؟ بێتو کارێکی وابکەی بەلەعنەتت دەکەم.

منیش چارەم نەبوو . دەبوایە بسووچم و بساچم بەڵام ئیدی گەیشتبووە هێچکانم. نەمدەتوانی لەوە پتر توانەوە و لە نێو چوونی خۆم ببینم . تکایە بە کەس و کارەکەم بڵێ لێم نەگەڕێن چوونکە ئیدی نامدۆزنەوە .

سەرکەوتوو بی ."سامرەند"

نەک جارێک و دوو جار چەند جار نامەی سامرەندم خوێندەوە خەمێکی گەورە و گران ، گیان و لەشی داگرتم . سامرەندی هونەروەری هێدی و لەسەرەخۆ ..؛رۆژینی جوانی بێ وێنە، هەمینی ئێسک گرانی بێهەست و زەوق ... باوکی دوور لە دنیای لاوان ... هەمووی وەک پەردەی سینەما بەبەر چاوما دەهاتن و دەچوون . منیش کە خۆشەویست ترین هاوڕێمله دەست داوە تەنیا نیم و خەمێکی هەمیشەیی بۆتە هاواڵم ....

رۆژێکی گەرمی هاوین ،لەو رۆژانەی کە هەتاو دار و بەرد دەبرژێنی ، تەنیا بە شەقامێکی شارێکی گەورەدا رادەبردم. هەستم دەکرد گرژم داهێزاوم بەڵام بۆ ؟ باش نازانم .لەسەرەخۆ بەبێ وازی هەنگاوم هەڵدەبڕی. جاروبار سەرم هەڵدێنا بۆ دەور و بەر بەڵام نەمدەزانی لە چی بڕوانم. دیمەنی شار بۆم شتێکی ئاسایی بوو. هەمیشە وەکوو گوندێکی چەند گەڕی دیلان و گۆوەندی تێدا بگەڕێ یا چەند مردووی خۆشەویستی لێ مردبێ و لە نێو تەم و مژی خاکەلێوە و دووکەڵی متبەقاندا ون بووبێ، تەم و تومان دایگرتبوو . هاڕەی فڕۆکە ،تەقە و شەقەی کارخانە و هاڕ و هووری ماشێن و ... لە هەموو شوێنێکی سەر ئاوەلای شارەوە گوێی پیاویان ئازار دەدا .هەرچەند شقامەکە تا رادەیەک چۆڵ بوو بەڵام دیسانیش هەرا و هوریای شەقامەکانی دەور و بەر و شوێنەکانی تری شار ، ئیجازەی پێ نەدەدام بیر لەو شتە بکەمەوە کە گنجی خستبووە نێو چاوانم بەڵکوو رۆچنەی

چارەیەک بدۆزمەوە تا تاریکایی خەم و خەفەت بتارێنێ، زەردە بێتە سەر لێوە بزە لێزیزەکەم .

کە سەرم هەڵدەبڕی بەر لە هەموو شتێک، خانووبەرە بڵندەکان سەرنجیان رادەکێشام: دیواری خشتی تایبەتی ،بەردی مەڕمەڕ، پەنجەرەی جۆراوجۆر پەردەی حەریر و کرکرە،گوڵدانی بەرهەیوان و بەرپەنجەران هەمووی بۆ چاولێ کردن دەبوون تەماشام دەکردن ، ئەویش بە ناتەواوی چونکە بێتو ویستبام بزانم خانووبەرەکان چەند نهۆمن و سەریان لە کوێ گەڕاوەتەوە و هەتا کوێ لە ئاسمان رۆچوون ، دەبوو بەراو پشت بم ، ناعیلاج چاوم دەبڕیە شەقامی دوور و درێژ و پیادەڕۆیەکەی .

هات و چۆ کەم بوو . بە چلۆنکایی پیرێژنێکی قەرتاڵە بە دەست و پشت چەماو کە چارشێوە رەشەکەی توند لە خۆیەوە پێچابوو ولە درزێکەوە دەیڕوانییەوە بەر پێی یا کیژ و لاوێکی تەڕپۆش کە باسکیان تێک بەزاندبوو، بە پەنامدا رادەبردن .

تورمبێزی ماشێنێکی "ئاخرین سیستم" سەرنجی بۆ لای خۆی راکێشام.بێئیختیار راوەستام ، دەستم بە نەردەی پیادەڕۆیەکەوە گرت و چاوم تێ بڕی. پیاوێکی مل باریک دابەزی . دەرگای لای خۆی گالـە.دا . دەستێکی بە کراواتەکەیدا هێنا . بە پێشەوەدا چوو بۆ ئەودیوی ماشینەکە . دەرگای ئەولاش کرایەوە .ژنێکی چاویلکە لە چاوی سەر رووت هاتە خوار. پەتجەی کەوشە بریقەدار و پانیە بڵندەکەی لە سەر ئاسفاڵتەکە دانا . بەلەکی رووت

و گۆشتن و سینگ و بەرۆکی نیوە داپۆشراو دەرکەوت .

ئەویش بە ئارامی دەرگای لای خۆی پێوەدا .چاویلکە مەیلە و سوورەکەی بێ ئەوەی کە لە گوێی جوێ بێتەوە بەرەو ژوور برد و لە سەر پەرچەمی رەشی جێگیر کرد . دەستێکی بە سەر و بسکیدا هێنا وسەرشانی پێ داپۆشی. چاوێکی لە دامەنەکەی ، کە بە ئاستەم ئەژنۆی دەنگاوت ،کرد، کیفـە شیک و جوانەکەی لە قۆڵی کرد و دەستەکەی دیکەی لە باسکی کابرا وەرێنا و بە جووت لە پلیکانەکانی ساختمانێک وەسەر کەوتن کە لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو"سازمان تأمین رفاه اجتماعی"وەژوور کەوتن . دیسانیش چاوێکم بە نووسراوی سەردەرگا و دیمەنی ساختمانەکەدا گێڕا . واقـم وڕمابوو . پێم سەیر بوو ئەوانە بۆ دەبێ بچنە ئەم ئیدارەیە .ئەگەر بەوناوە بێ کە لەسەر دەرگاکەی نووسراوە ئەو ژن و پیاوە هیچ پێوەندییەکیان بەم ساختمانەوە نیە. ئەوان چی

و ئێرە چی؟ بە ناوەکەی را
ئەو ئیدارەیە دەبێ دەستی
لێقەوماو و بێ‌ئەنوایان بگرێ
و ژیانی خۆشیان بۆ دابین
بکا .ئەوانەش وێ ناچێ لەم
بابەتەوە کەم و کووڕیەکیان
هەبێ .ئەمجار کەوتمە دوو دڵی
و بە خۆم گوت : لەوانەیە
کاربەدەستی ئەم ئیدارەیە
بن . بەڵام زۆر لە دوو دڵیدا
نەمامەوە .ژن و پیاوەکە
هاتنە دەرو سواری ماشێنەکە
بوونەوە و رۆیشتن .

هەر چەندی لێکم داوە ،
فایدەی نەبوو .لەمەڕ پێوەندی
ئەوان و ئەو ئیدارەیە هیچم
بۆ نەچۆوە سەر یەک . بەڵام
چی وا پێ نەچوو ژن و پیاوێکی
دیکە هەر بەو چەشنە لەو
ساختمانە وەژوور کەوتن ....
نەخێر، دیتم بیر کردنەوە
بێفایدەیە و جگە لەوە کە
زیاتر سەخڵەت بم ئاکامێکی
نیە . دەستم لە نەردەی
پیادەڕۆ بۆوە و پێم هەڵبڕی .

لەبەر کەم برستی بیوم
حەزم نەدەکرد خۆم زۆر بەم
مەسەلەوە خەریک بکەم .
هەروا چاوم دەگێڕا تا بەڵکوو
شتێکم چاو پێ بکەوێ خۆمی پێ
بخافڵێنم . چەند هەنگاوێک
رۆیشتبووم ، گەیشتمە راستی
بەتاڵایی‌یەک .ئاوڕێکم وێ دا .
رەشایی‌یەکم دیت ، راوەستام
و پاڵم وەدارێکی قەراغ
شەقامەکە دا . دەستم لە
پشتەوە گرێ دا و چاوم تێ
بڕی .

دەوری بەتاڵایی‌یەکە بە
دیواری ساختمانەکان گیرابوو
تەنیا لای شەقام ئاوەڵا بوو .
کەلاوە بوو .یەکێک لەسەر
ئەژنۆ و چنگان لەوێدا
دەسووڕایەوە .لەڕ و لاواز، بۆر
و دژوێن ، سەر قرژن و دزێو
بوو .زبڵ و خاک و خۆڵی نێو
کەلاوەکەی هەڵگێڕ و وەرگێڕ
دەکرد . چنگی تێ وەردەدا
دەست و لاقی وەهەر کوێ
بکەوتایە ، بە هەڵپەوە چاوی
لەو شوێنە دەبڕی . دوای
ماوەیەک گەڕان راست دەبۆوە.
کراسێکی شڕی لەبەردا بوو
تەنیا چەند تیتۆڵ و بزگوڕ
بوو ، لاکەلەکە و سەرشانی
داپۆشیبوو .لەبەر چڵکنیان
بە زەحمەت دەناسراوە .بەندی
شاڵوارەکەی بە هەودا بەنێک
بەستبوو .هەندێک بەسەر پێوە
رادەما و چاوی بە دەور و
بەریدا دەگێڕا ، دیسان
دادەهاتەوە و دەستی دەکردەوە
بە پشکنین .دیمەن و رواڵەت
و سەر و سیماکەی ببووبە هۆی
ئەوە کە بەزەییم پێیدا بێ .
حاڵی خۆم لە بیر چۆوە ، پێم
خۆش بوو بزانم بۆ وادەکا ؟
دەبێ چی لێ ون بووبێ؟ هەروا
کە چاوم لێ دەکرد، لە دەور
و بەریم دەڕوانی بەڵام چم بۆ
ساغ نەبۆوە . بیرم بەوانە
رانەوەستا و تاوێک لەوە
پێشم هاتەوە بەرچاو :ماشێنی
ئاخرین سیستم ،بەرگی رازاوە
و رێک و پێک ، چاویلکەی
مەیلە و سوور ،کیفی تایبەتی
و لە هەموویان گرینگتر ،
"سازمان تامین رفاه اجتماعی"

هەروا لەم بیرانەدا بووم
کە وەک برووسکە لێم بدا ،لە
جێی خۆم وشک هەڵاتم .هەستم
کرد ئەژنۆم دەلەرزن و ناتوانم
لەسەر پێیان راوەستم .
لەسەرەخۆ هەڵترووشکام .هەموو
بیر و هۆش و چاو و گوێم
دەربەستی کابرا بوو .ئەویش
دانیشتبوو .لە پشکنین وێستا
بوو. پاڵی دابۆوە ، لاقی
راکێشابوو .یەکێک لە لاقەکانی
سواری ئەوی دیکە کردبوو .
ددانەکانی لە بن لێوە چرچ و
بۆرەکانیدا سپی دەچوون .
دەتگوت دەیەوێ پێ بکەنێ .

ئەمجار بەڕاستی پێدەکەنی
شتێکی بۆری بە دەستەوە بوو.
لێی خورد دەبۆوە ، ئەم دیو
ئەو دیوی دەکرد. دەستی پێدا
دێنا . دوای هێندێک رامان
بۆ لای دەمی برد . روون
نەبۆوە چیە ،زۆری لێ خورد
بوومەوە .ئەمجار بۆم دەرکەوت ،
دەسکەوتی ئەو هەموو گەڕان و
پشکنینەوەی بوو:کوتە نانێک
بوو کە بە ئیشتیاوە دەیخوارد.

ئەویش چاوی تێ بڕیبووم.
هەروا کە دەمی دەبزاوت ،
پێدەکەنی.یەکدا بە دوو بە
دڵمدا هات کە لەوانەیە شێت
بێ . شکم هەبوو بەڵام لەوەدا
هیچ شکم نەبوو کە :
ئینسان بوو، برسی بوو!

**پاشماوەی کورتە باسێک ...**

نالکێنین،وەک : **هەڵ لەرزین ، هەڵ لووشین** و ...

١٥ – لەگەڵ ئەوەی پێویستە برگەکانی هەر وشەیەک بەسەر یەکەوە و بە جوێ لە وشەکانی ئەم لا و ئەولای بنووسرێن ، دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە " **و** "ی عەتف و زۆر وشەی یەک پیتی و دووپیتی وەک : **چ** ، **چی** ، **دا** ( سێهەم شەخس لە فیعلی دان و لێ دان ) و ... بۆ خۆیان وشەیەکی جیاوازن و دەبێ بە جوێ لە وشەکانی تر بنووسرێن ، وەک : " **وت و وێژ** "، ، " **کشت و کاڵ** "، " **چ دەکەی** " ، " **ئەو کتێبەی بە عەلی دا** "، " **لەو سەگەی دا** " و ...

بەڵام ئەگەر بنووسین " ئەو کتێبەی بە عەلیدا ناردەوە" دروستە چونکو لێرەدا "**دا** " فیعلی سێهەم شەخس و وشەیەکی جیاواز نیە و پاشگرە .

١٦ – ئەو وشانەی تەشدید ( گیرەیان ) هەیە لە کوردیدا بە شێوەی ئاسایی بەبێ تەشدید دەگوترێن و دەنووسرێن ، وەک :

**مەلا ، حەمە ، موزەفەر ، قەساب ، نەجار ، . .** لە جێگای ملاّ ، محمّد ، مظفّر ، قصّاب ، نجّار و ... .بەڵام ئەگەر لە جێگایەک تەشدید تەلەفوز بکرێ ، ئەو پیتەی تەشدیدی لەسەرە دوو جار دەنووسرێتەوە ، وەک : **گوللە ، زللە ، عەییار ، و ...**

( تەواو )

**لێرەدا کە کۆتایی بەم کورتە باسە دێنین ، رادەگەیەنین کە تا ئێستا لە لایەن ژمارەیەک لە خوێنەرانی بەڕێزی " سروە "وە رەخنە و پێشنیارمان گەیشتوەتە دەست کە خوا یاربێ لە ژمارەکانی داهاتوودا لاپەڕێک بۆ بڵاو کردنەوەیان دەکەینەوە . داواش دەکەین هەر ماموستا و خاوەن ڕایەک نەزەرێکی تایبەتی هەیە بۆمانی بنێرێ. دڵنیا بێ بڵاوی دەکەینەوە . بەڵام هەر وەک پێشتر رامان گەیاندووە ئێمە دەست لە رێنووسی خۆمان نادەین تا کونگرەیەک لە ماموستایان و شارەزایانی زمان و ئەدەبی کوردی بڕیاری دوایی لەسەر بدا.**

" خوا یارمان بێ "

---

## دەست درێژکەر

«سید جلال الدین نظامی»

دەستی تە بشکێت ئەی دەستدرێژکەر
ناڤێ تە ببریت ل هەرجی و دەر
مێژوو دبێژیت ژ رۆژێد تاری
ژ بێ بەختی و زولم و زۆرداری
ژ کەدخارنا هێزێد کۆلەدار
ژ زۆرداری و تالانێد هەر جار
ژ ئاه و ئێش و ژ دەرد و ژانان
ژ بێ هێزی یا بێ دەڤ، زمانان
ژ شین و تازییا دایکێد دل کەسەر
ژان و کوڤانێت سێڤی یێد بەردەر
بەلێ رووپەرێد مێژوویا بەشەر
پرە ژ خورت و مێرێد خەباتکەر
رابوونە همبەر زولم و زۆری یێ
خوێینانە دەر ژ سەر شۆری یێ
ژ کونج و رەخێد جهانا بی سەر
ژ بن دەستی یێ رزگار بوون یێکسەر
جان گۆری کەرێد رێکا راستی یێ
خو گۆری دکەن بۆ سەربەستی یێ
زمان بهاری ، مللەت بوون هوشیار
رابوونە سەرخوە فەقیر و هەژار
بدەنگ و قیرین ، ب مستێد گرێ
بەر هەلاکرن دوژمن بۆ دەرێ
سەری کەدخواران دارێڤە کرن
دەزگاهی زولمێ ئاڤێدا برن
لڤێ دەماکو خەلک شارەزایە
چەکی زانینێ ل دەست و اندایە
عومرێ زۆرداران دێ هەر فەنابیت
دەستدرێژکەران دەوام چنابیت

**پاشماوەی سروەی ...**
هینەکانی کرد ، قانیع نەیهێشت زۆری درێژە بداتێ گوتی باوکم ئەمە چی ئێژی ، بە خوا ئەگەر دایکی ( کوتەک )لەترس من بوێرێ شیعر بێژێ، زۆر لەمانە خاستر ئێژێ "

پاش حەسانەوە چووینەوە سەرکار هێشتا کازیوەی نەدابوو هێشتا گوڵە جوانەکانی کوێستانی کوردستان بە سروەی بەیانی نەپشکووتبوون کە " سروە "ی ئێمە کاری تەواو بوو، هیوادارین ئەم سروە تازە نەرمە فێنکایی بخاتە هەناوی سووتاوی کوردی تامەزرۆی بێ بەش و چارە ڕەش و دڵی وەک گوڵی ئەدەبدۆستان،خاوەن هەستان، ڕووناکبیران و مامۆستایانی لێزان و دڵسوز و لاوانی زرینگ و وریای کورد بپشکوێنێ .

---

**پاشماوەی یادی...**
ئەمڕۆ لە کوردستاندا کاریان بۆتە دزی و فزی لە شاعیران و نووسەران ، بێ پرس و ڕا کتێبان چاپ دەکەنەوە و ئاوڕ لە ویژدان و شەرەف نادەنەوە ڕاستی ئەمانە خەتەرن و بەر لە زۆر نووسەران دەگرن کە بە کاری خۆ دڵخۆش کەن . لاوێکی کورد کە بزانێ هەرچی نووسی ئەو دزانە هەر لە حەوا دەیقۆزنەوە و هەق و مەقی بەر پێ دەدن چۆن واز لە نووسین ناهێنی و ناچێ کارێکی تر بکا کە بەرهەمێکی پێ بگا ؟... ڕاستان دەوێ ئەو کەسانە نەنگی ناو شارەکانتانن، تا دەتوانن لە ناو خۆتانیان دەراوێن.با ئاکاری کۆمەڵگاتان وەک ماڵ و کۆڵانەکانتان پاک و خاوێن ڕابگیرێ . مامۆستا سەجادی کە مرد، ئەگەر کاری ناپەسەندیشی کرد بێ، کە نەشی کرد .دەگەڵ خۆی بردە بن گڵی . ئەو بەرهەمەی لەو بە میرات ماوەتەوە هەر وشە کوردییەکانی بێ و هیچی تر نا ، دەتوانین فەرهەنگێ قەبەی لێ پێک بێنین و بیکەینە مایەی شانازی و بە "علاء الدین" بنازین .ئەو کەسەی چوو میژووی ئەدەبە کوردییەکەی بێ پرس و ڕای ئەو چاپ کرد و هەقەکەی خوارد، خۆی لەسەر کۆنەی ویژدان بوارد. بەلامەوە ئەو بە سووکی لێ ڕوانینەی نووسەرانی بەکارمانە .پوختەی وتار تکا دەکەم شاعیر و نووسەرەکانتان کە پارێزگاری فەرهەنگ و زمانتانن هەر بە زیندوویی مەمرێنن و بە مردوویش پێی ناوێ بە مۆمیایی بیان هەنوون و تازە نرخیان بۆ دیاری کەن مەیکەن بە نەقڵی چەقەڵی کابرای بەغدا!

خودا حافیز

---

**ڕوون کردنەوەیەک لەسەر فۆڕمی ئابوونمان**

**ئەو ١١٠ تمەنەی کە دەینێرن بۆ ئابوونمانی شەش مانگ یا ساڵێک نیە ،بەڵکوو بۆ شەش ژمارەی " سروە"یە کە خەرجی پۆست کردنیشی خراوەتە سەر، دیارە بۆ داخوازان لە دەرەوەی وڵات زۆر و کەمی زێدە خەرجی پۆستیشی دێتە سەر ، کە بۆخۆیان دەتوانن بەراوردی بکەن .**

**اورمیه : صندوق پستی ٧١٧ ، تلفن ٣٥٨٠٠ ،**

**ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی**

**ئینتیشاراتی صلاحالدینی ئەییووبی**

## گاڵتە لەگەڵ نووسەرانی سروە — زیانی خۆڕۆ

* چ بنووسین ؟

**ـ شتێکی باسی سەر نەبێ .**

* ماموستا پیرەمێرد ... باسی قارەمانەتی صاحبقرانەکان دەکا و ئەوە بە بڕوای من وادەردەخا کە ئەو بنەماڵەیە هەمیشە شاعیر و هونەریان بووە .

**ـ ئێمەش هاوسێیەکمان هەیە کە بنەماڵەکەیان دارتاش بوون ئەوەش بە بڕوای من وادەردەخا کە ئەو بنەماڵە دوکتۆر و وەکیلی باشیان لێ هەڵ دەکەوێ .**

* ئەسپ سەری هەڵتەکاند و دەستی کرد بە کۆڕژن و سەرکێشی،وا دیار بوو دەڵێ.... ئەم چەمەی من دەیبینم ئەسپ سەهلە کلێ پردیش هەڵدەتەکێنێ چاکتر وایە واز بێنی .

**ـ چاوی سەرم بی بۆ ئەسپت .لە خاوەنەکەی ژیرترە .**

* دایە بەو جلانە لە بیمارستان باشتر دەتوانم هەڵسووڕێم دەنا لیباس ئازادە و دەتوانم بە جلی کوردیشەوە بچمە بیمارستان.

**ـ چی..؟ وەباڵ بە ئەستۆی ماموستا .**
هونەرمەند، زانا، نووسەر، هەر کامیان " پەنجەرەها "یەکن لە شوورەی پۆڵا وبەردینی نەتەوەکەیان ...

**ـ تکایە هەمووی بە فارسی بنووسە تا بزانم دەڵێی چی ؟**

* ناوی صلاحالدینی ئەیوبی پەیوەندێکی زۆر نیزیکی بە مەڵبەندی فەلەستینەوە هەیە .

**ـ باش بوو روونت کردمەوە ئەمن پێم وابوو پەیوەندێکی زۆر نیزیکی بەکوردستانەوە هەیە .**

* سارد و گەرمی رۆژگار مەودای خستبووە نێوانمان .

**ـ لە سارد و گەرمی رۆژگار پەند وەردەگرن ئەتۆ چ پەندێکت وەرگرتووە؟ رەنگە "منداڵە هاج و واجەکان " نەیانهێشتبێ .**

* میکرۆب چیە ؟

**ـ شتێکە ئەوەندە !**

* بەهاری جەوانان .

**ـ پڕە لە گیا پشیلە و کەرتەشی و گوێنی وشتر خۆرکە و بەنگ و شتی والە..**

* مزگێنی

**ـ بۆ ٥٠ ساڵی دی چاوەڕێی چاپی <u>٥</u> کتێب بن .**

* چۆن دەبێ رەشەبا و زریان ئەرکی خۆیان بەجێ نەهێنن .

**ـ کێ ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە تا ئەوان بە جێی بێنن ؟**

* بەرکوتێک لە خەرمانی ....

**ـ ئای نەوسن چەوەڵێ ناکەی**

* لە نەخۆشخانە راوێژکەرم پەرستارێکە .

**ـ ئەدی لە " وەتاغی کاولاش " دا ؟**

---

### فۆرمی ئابوونمانی گۆواری سروە

**من ..................... سەد و دە تمەن ( ١١٠ ) پوولم بە حیسابی ژمارە ٥٤٠٠ ی بانکی سپە ، شوعبەی مەرکەزی ورمێ ، ( اورمیە ) بە ناوی ئینتیشاراتی صلاحالدینی ئەیوبی بۆ ناردوون . داوا دەکەم لە ژمارە ............ ی سروە بەدوام جار لەگەڵ جار بۆ بنێرن ، ناو نیشانم ئەمەیە :**

**ناونیشان : ..................................................................**

**..........................................................................................**

مووسا گەرمیانی

گەڕەکی ئێمە تادەهات بەهێزتر دەبوو، ڕۆژ بە ڕۆژ ئاوەدانتر و هەراوتر دەبوو، ئەگەر ماڵێکی تازە هاتبایە گەڕەکەکەمان ،ئێمەی منداڵ و مێر منداڵ بەر لە هەموو شتێک زەینمان دەدا چکۆلەکانیان بزانین ئایا بەگوڕن؟ ئازان؟ یا ترسەنۆکن ؟ هێندیان بە شاخ و باڵماندا هەڵدەگوت غوللور بووین و بڕوامان هاتەسەر ئەوەی کە دەتوانین هەڵمەت بەرینە سەر گەڕەکی رزگەیان و تێکیان بشکێنین . منداڵی گەڕەکی رزگەیان زوربەیان لە گوندەکانی دەوری شارڕا هاتبوون و تازە لەو کولانە نیشتەجێ ببوون .ئەوان لە ئێمە مانان باو خۆشتر و توند و تۆڵتر بوون .چەند جار بە شەوی رەمەزان دەستەمان لێ ساز کردبوون و لە ئەنجامدا شکا بووین و هەڵاتبووین! ئێستا قەدەرێک بوو زۆرتر دەگەڵ ئەو گەڕەکانەی شەڕیان خۆشتر بوو بەشەڕ دەهاتین و وازمان لە رزگەیان هێنابوو، گەڕەکی"ئەرمەنیان"کە ئێمەی لێ بووین بۆ دەرمانیش یەک ئەرمەنی لێ نەبوو،"خانم ئەوڕاهام" نەبێ .(کە بۆ دەرمان نەدەبوو.)کۆڵانە ـ کەمان زۆر قەرەباڵغ و خۆش بوو، بە تایبەت ئێوارەکانی کە کچان بەر دەرگای کووچەیان ئاو پرژێن دەکرد و دەیانماڵی بۆنی خۆڵ و فێنکایی هەوا دەگەڵ هات و چۆی جەحێڵان و کوڕ بەستنی ژنان ، دڵی ئینسانی دەکردەوە . وەک شاعیرمان دەڵێ :

**گەڕەک ئەرمەنیە بەهەشتی گۆڕین**
**روو لە هەر لایە دەکەی هەر حۆرین**

لەبیرمە زوربەی ماڵەکان فەقیر بوون بەڵام هێندەی ئێستا خەڵک دەربەستی بوون و نەبوون و ماڵ و سامان نەبوون ژینیان لەگەڵ بێ سامانیش وەک خەونێکی ئارام و بێ ڕووداوە ،ساکار و بێ ئاژاوە، لە نێو کۆڵانی بە پێچ و دەورە لە نێو ماڵی دیوار مۆرە و بازاڕی پڕ هەرا و زەنادا رادەبرد .

هێشتا دووکانی سەرداریخانە و قاوەخانەی هەمیشە ئاوەڵە تاک و تەرا هەبوون و شەوانی رەمەزان لەوان دووکانانەدا بەزمی "جۆرابێن"و"میرمیرێن" دادەمەزرا .ڕۆژی جێژنان ئیشکە ڕن هەڵدەپەڕین و نەک هەر منداڵ ،پیاوی گەڕاوەش خەریکی کایە و گەمە دەبوون و شەو درەنگانێک بەرەو ماڵ دەبوونەوە .بەوچاوەی ئەوان لە دونیایان دەڕوانی، ژیان بە هەموو تاڵی و شیرینی و هات و نەهاتی خۆی،رووداوێکی پیرۆز بوو.

بەڵام شەڕە گەڕەک بۆ خۆی شتێکی سەیر و سەمەرە بوو، ئێستە کە بیری لێ دەکەوەمە، هیچ هۆیەکی ئەوتۆم وەبیر نایەتەوە کە بۆ ئەوە ببێ ، منداڵی دوو کولانی شارێک ئاوا بێبەزەیییانە یەکتر دارکاری بکەن .

سەرگەورەی ئێمە کە هیچمان لە قسەی دەرنەدەچووین کوڕیکی کەڵەگەتی نەترس و بەزیپک و هەتا بڵێی قوڵم

بوو، زۆریش لە منداڵەکانی گەڕەکی رزگەیان داخدار بوو، لە دەرفەتێک دەگەڕا لەشکریان لێ بکا و هەرچۆنێک بێ بنێیان بدا، تا ناوی گەڕەک هەرمەنی وەک یەکەم گەڕەکی شار بزرینگێتەوە.

چەند گەڕەکی وەک "پشت قەلاّ" و "سەرپلووسگ" و "سەرخڕێ" و کۆپین ئاوا"مان بەزاندبوو. گەڕەکی رزگەیان نەبێ ئەوانی دیکە لە ئێمە شکستیان خوارد بوو یا هێند لە کۆلاّنی ئێمە دوور بوون کارمان بەسەریانەوە نەبوو. ئەوەندە دەگەڵ گەڕەکان بەشەڕ هاتبووین ئەگەر یەکێکمان بەتەنێ بە کوڵانێکی دیکە دا چووبا، بەسەر و گوێلاکی شکاو نەبا دەرباز نەدەبوو.

ئەو شەوەی باسی دەکەم، دوای راوێژ و تەگبیرێکی زۆر بڕیاری هەڵمەت بردن بۆ سەر گەڕەکی رزگەیان درا.

هەموو لە سووچێکی کۆلاّن کۆ بووینەوە کەوش و پێلاّومان توند کرد و گۆپاڵ و گالۆکمان بەدەستەوە گرت و وێڕای هاندانی سەرگەورە، کە بە دەنگێکی نێرانە دەنگی دەدایین، ئەو لە پێشەوە و ئێمە چل پەنجا منداڵی کوتەک بەدەست بە پێکەنین و قیژە و هەرا، بە دوایدا وەڕێ کەوتین.

هێند بەپەلە بووین و بڕوامان بە خۆمان پەیدا کردبوو، نەمانزانی چۆن گەیشتینە ئەو مەیدانەی رۆژی پێش بۆ شەڕ دیاری کرابوو، چمان دیت؟ لەشکرێک زەلامی قۆچاخ و رەش و رووت و قۆڵ هەڵماڵیو کۆ ببوونەوە کە هیچیان لە منداڵ نەدەچوون! ئەی خودایە! جا ئەوانە بابەکانیان دەبێ چۆن بن؟ گۆپاڵەکانی ئێمە لەچاو هی ئەوان دەتگوت شووڵە بین؟ بۆ بەدبەختی هێندێک لەوان سەری گۆپاڵەکانیان بە مز و بزمار والێ کردبوو ئەگەر لە سەری فیلت دابا سەکەتی دەکرد. هێشتا فەرمانی هێرش لە لایەن سەرگەورەکەمانەوە نەدرابوو، ئەوان هەر وەک سامۆرایی بە قیژە قیژ و جنێو دان دەورەیان گرتین، جنێو چ جنێو! شتی وایان دەگوت بەردی دەتواندەوە.

قسه و فەزیحەتی وایان بەسەردا دەباراندین لەزەبری گۆپاڵەکانیان گورچووبڕتر بوو . لە هێندێک جنێوەکانیان هەر نەدەگەیشتین . دەنگی تەپە و شەققەی شەق و گۆپاڵ کە لە پشت و سەر و پۆتراکمان دەدرا لەگەڵ هەڕەشە و گوڕەشە و شیرە شیر و قوولە و هەرای کرمانجی گەڕەکی رزگەیان تێکەڵ دەبوو . هەراو بەزمێک بوو هەر وەرە سەیری .خەڵکی گەڕەک سەریان لە پەنجەرە و دەلاقە و دەرگاوە هێنابووە دەر و تەنانەت هێندێکیش بۆ نێو بژی و بەریوانیمان هاتن. بەڵام لەمەیان پتر وەسەر و گوێلاکی کەوت و بۆی دەرچوون.

کوڕەکانی ئێمەش چاکیان دەوەشاند بەڵام وادیار بوو ئەستێرەی بەختمان لە خامۆشی دابێ . ئاخری سەرگەورەکەمان قیژاندی و فەرمانی پاشەکشەی دا . دەگەڵ دەرچوونی لەشکری ئێمە دەنگی هەڕەشە و گوڕەشەی زەلامەکانی گەڕەکی رزگەیان بەرزتر بۆوە :"هەڵاتن ! هەڵاتن ! یا خوا بەخێر نەهاتن ! نەیەنەوە مارز بابینە! ...

بەو کووچە و کۆڵانە تاریک و تنووکەدا ،بە سەر و گوێلاکی خوێناویەوە ، لێک هەڵبڕا و تاک و تەنیا لەگەڵ دوو سێ کەسی دراوسێ ، لوور بووینەوە . سەرباقی ئێشی گیانم ترسی دارکاری بابیشم لە دڵدا بوو ، دەبوو بە لینگێک کەوش و دەلینگێکی داقەڵشاو و سەر و لووتی داژەنیوەوە ، چووبامەوە بەر دەستی دایک و بابم !

شەو راشکابوو ، ئەو چەند چرایەی ماڵان کە شەوقیان لە پەنجەرەکانەوە دەگەیشتە کۆڵان و تۆزە رووناکی یەکیان دەدا بەر پێیان ،کوژابوونەوە. بێ دەنگی شاری داگرتبوو. لە دەنگی کارخانەی بەرق بەدەر کە لە سەرەوەی گەڕەکی ئێمە بوو ،هیچ هەست و خوستێک نەبوو .ئەو کارخانە ئەوەندەی تەقە تەق و شات و شووتی بوو ، ئەگەر ئەوەندەی چرا هەڵکردبا هەموو شاری چراخان دەکرد .

بە شەلە شەل هەڵدەهاتم کە زووتر بگەمەوە ماڵ ،هەروا بیرم لە کاری خۆم دەکردەوە لە نەکاو ئەوەندەم زانی ژێر پێم رۆ چوو ، کەوتمە نێو چاڵێک ،بۆگەنیوی چاڵەکە و تێوە چوونی پێ و پلم هەست پێ کرد ، بەهەزار کێشمەکێش خۆم هەڵکێشا و هاتمە دەر ، بە جارێک کارم کرا ! زانیم ئەگەر هەتا ئێستا هەر بابم لێم تووڕە دەبوو ئەوجار دایکی پاک و خاوێنیش لێم دەتۆرێ و تازە لەسەرم ناکاتەوە !

هەروا کە بەرەو خوارووی کووچە دەهاتم گەیشتمە بەر دووکانەکەی "میرەی" چراتۆکەی دووکانی میرەی مەیدانێکی رووناک کردبوو ، لە سووچێکی دانیشتم و لەبەر تیشکی چراکە بە قاقەزە شڕان دەستم بە خاوێن کردنەوەی لاق و لەتەرم کرد .میرە سەرێکی لە پەنجەرەی دووکانەکەی هێنا دەر ،کە چاوی پێم کەوت بزەیەکی هاتێ و سەری بردەوە ژوور . بە شەرمەزاری هەستام و خۆم گەیاندەوە ماڵ ، لە دڵی خۆمدا هەر جنێوم بە سەرگەورەکەمان دەدا .دەرگای ماڵ پێوە درابوو بەڵام گۆڵەکەیان نەختبوو ، بە ئەسپایی خۆم دە ژوورێ خزاند .دایکم هێشتا خەوی لێ نەکەوتبوو . بابم وادیار بوو تازە نوستووە . بە ترسەوە سڵاوم کرد ،دایکم بە سرتە جوابی دامەوە و گوتی : ئەوە هەتا ئێستا لە کوێ بووی؟ بە خودای بابت هێندە تووڕەیە دەتکوژێ ! ( دە دڵی خومدا گوتم: وەڵڵا کەمیان کوشتووم ! )

دوایە هەستی بە بۆنی بەرگ و پێڵاوم کرد و هاواری لێ هەستا : ئەیە ڕۆ ئەو بۆگەنیوە چیە؟ ئەوە بۆ وات لە خۆ کردوە؟ دەنگم نەکرد . بە بێ‌وازی جلەکانم داکەند و لە پاشخانەم دانان و چوومە ناو جێگاکەم . دایکم لەبەر خۆیەوە هەر پرتە و بۆڵەی بوو .

شەڕی گەورە سبەینێ هەڵدایسا!

هەر وەک شەوان، تاسەی دانانی پارچە شیعرێک ، لە ژوورە گچکەلانەکەیەوە ڕەپاڵی نابووە ،قولینچکی زارکی ئەشکەوتە تاریکەکەی ئەوپەڕی دێ .

شنەی زریانی بلاوێن و خەم ڕەوێن دلدانەوە و لاواندنەوەی زەوی بڕژاوی بزە و نیگای ئاورینی هەتاو بوو .

لەسەرەخۆ ، بە ئارامی بێ لەمپەر و بەرگر، شاباڵی لێک دەدا و ئۆخژنی دلانی بە دیاری دێنا .

تریفەی کانیاوی مانگ ، گۆمیلکە گۆمیلکەی ئەستێرانی وەها پڕکردبوو ، کەلاویان دەکرد، شۆق بەلووزە دەباری .. پالی دابۆود ، چاوی بە تاقی ئاسماندا دەخشاند . بە سپایی سەری قەلەمەکەی لە نێوردێن و سمێلیدا دەگێڕا . دەتگوت خەریکی بوورە دەرهێنانە ،بەڵام لەبەر گیا و گوڵ و فریزووی تێکچڕژاو دەبێ زۆر وردی بکێلێ و باشی وەرد بداتەوە و خۆشی بکا .

جار جارەش لە ناکاوڕا هێڵ و هۆگانی بەجێ دەهێشت نووکی قەلەم سەرەوخوار لە گوێن فرمێسکی هەتیو دادەڕژا و بە رووەمەتی کاغەزدا دەخوشی

سەرخۆش و دلخۆش لە مێرگوڵەی شیعردا ئاولان و دەستەملانی هەستی ڕاکشابوو و لە نێو دۆشەگی نەرمی گیا و گژدا دەتلایەوە .هەر چرپە و چرتە و خورتە و سرتەیەک لە ناخیدا شوێن و شوێنەواری بەنرخی بەجێ دەهێشت، تا لە دێڕی شیعرەکانیدا بۆ هەمیشە بمێنێتەوە .کۆتوی دلی دەینالاند و دەیگماند .

رادەما ، تێدەدەما . لە دەریای خەیالدا سواری لۆتکەی وشە دەبوو ، سەولی دەدا ، دەسووڕایەوە تا بەدی کردنی مەبەست و وەدی هێنانی ئامانجی . دەریای خەیاڵ بێسنوور بوو ،جار جار شەپۆلێک قەلبەزەی دەکرد و بلاو دەبۆوە .

ماشەری ڕەشی شەو بێپسانەوە هەلدەوێزرا .

زەمان بێوچان لە تەمەنی هەلدەبڕی و دەسەر تەمەنی دەکردەوە .نوقمی خەیاڵ لە جێگای خۆی خزیبوو ،گەیشتبووە پلەی ڕەوەزێک ، هێندەی نەمابوو هەلدێرێ ، کەچی خشپەیەک وەخۆی هێنایەوە، سڵ بوو، تێکرابوو، کشایەوە کە سەرنجی دا و چاک خورد بۆوە ، ناسینیەوە ،شیعری کۆنی بوون .

بزەی هاتێ !

چۆنە بەسەریان کودوومەوە سەیرە ! .

بە دەم ئەم قسانەوە، گەیشتنە پێشێ .لەبەر دەمی لێک هالان و پێی هەلگەران ، شاگەشکە بوو،وای دەزانی لە خۆشیانە و بۆنی پێوە دەکەن! ویستی بیانگرێتەوە ئامێز، بەلام گەمارۆی دەستیبان شکاند ،وا ڕەکێش کرابوون ، تا ئەوقای ملی نەبوون، نەوەستان ، گرێ دران ،وردە وردە ئەوکیان ڕێک کوشی ، ڕەنگی بزڕکا ، کەوتە دوودڵی چیە ؟ چ قەوماوە ؟ ناکا..؟ ئاخر بۆ ؟ بە تفی خۆخنکان ؟!

زانی کار لەکار ترازاوە وچی پێ ناکرێ ، بە هەموو دەمای خۆی تێکۆشا پشوویەک هەڵکێشی و هاوار کا ، بەڵام نا ، نا ، نەیتوانی ، بەری بینە قاقای گرا ،

ژیانی وەک شریتێک لە پێش چاوی هەڵوێزرا ، ژیان پڕ بوو لە ناکامی و بێبەشی و کوێرەوەری ،لە تێگەیشتن و پێ نەگەیشتن ،لە تەنیایی و پیش خواردنەوە ،لە هاوار و بانگاوازی بێوەڵام، بە کورتی لە تراویلکەی هیوا .

هەناسەی نەبان خۆی تێنەگەیاند. دوور لە چاوان لاقی جووت کرد و سەری نایەوە !

تۆماری ژیانی ژان تێزاوی پێچرایەوە ،بەرەو جیهانی بێدەنگی کەوتە رێ .

پاش دڵنیا بوون لە مەرگی ،شیعری ملی کرانەوە سەرەوخوار خلیسکانەوە بەر دەمی !

سەریان هەڵبڕی ، تێی رامان ،دیمەنی دڵتەزێنی بێتاوان سکاڵای لێدەباری. تاو و توێی پەشیمانی دایگرتن ،راتڵەکان ، لێک رەها بوون .

خۆیان پێ رانەگیرا !

ئاخر ئەوان هەستی ئەو بوون.

هاواریان لێ بڵند بوو. گوڕەی نیوەشەو لە دەرگای زۆر گوێیدا بەڵام بە داخەوەکەم کەس بە دەنگیانەوەچوون .

---

**پاشماوەی نامەیەکی ...**

بینووسم و نەبتوانم بەڕێی کەم هەر لە دڵمدابێ باشترە . بەڵام خۆ سەرەڕای ئەوانەش گلەییم زۆر لە دڵدایە گلەیی لە دڵم دەکەم زەمانێک من بە ویست و تەما و داوای ئەو داو داوی هەودای ژیانم دەڕست. بەڵام ئەو ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ رەزا نادا لەسەر ویستی من بێ ،رەنگ بێ چون من لە نووسین وەستام تۆش ماندوو بووبی و چاوەکانت لەسەر یەک دابنێی بەڵام تۆ بی و جوانیت ،کە منت دی ئاوڕێکی بەرەحمەتم وێدە..ئێستا خۆش ویستن لەگەڵ سەردەمی من زۆری نێوان و مەودایە .

نازانم ئێستاش بۆ وەدەست هێنانی دڵی خانوو مانێک چەپکە گوڵێکی خوێناوی بەسە یا لەوەش ئەستەمترە . هەرچی بێ ئەوەم بۆ نووسی بەڵام تۆش ئەوەم بۆ بنووسە با حاڵی بم. جا ئەوەدەم کە وەڵامی پرسیارەکانت دامەوە نامەیەکی پیرانەت بۆ بەرێ دەکەم .ئەوەش بزانە کە ئەگەر دەستم بە یۆسف راناگا بەبەرامەی کراسەکەی لە دوورەوەش رازیم . ئەگەر چاوم توانا و بڕستوبڕشتی دیتنی باڵای بەرزی تۆی نیە خۆ چاوی تۆ من دەبینێ و هەست بە بوونم دەکا . من پیرم دەزانی پیری چیە ؟ دوامین هەناسەی بەندی بەندیخانەیە لە ژوورێکی سارد و سڕدا . بە پیریت دەدوێنم و بە لاویت دەبینم .

## دیاری

## مەتەڵ[٢]

دەمی شاخە شاخی چەرم
دەنگی زلە تووکی نەرم

* * *

رەشە لاوازە بێچاو و گوێیە
کەچی کێشکچی بەردەرکی تۆیە

* * *

شاخی گایە بە باڵ مەلە
پشت ماسیە بە چوار پەلە

* * *

پارووی رەشە کشپەڵ سوورە
دەوری حەوزە نێو تەندوورە

* * *

وەک چەڵەمەی چەماوە
چوار دەوری چەرمی خاوە
زیندووم لە مردوو ناوە

* * *

# قسەی خۆش[٢]

### " برنج "

کابرایەک زۆر زوو قسەی لەبیر دەچوو ،رۆژێکی ژنەکەی پێی دەڵێ بۆ ئەوەی ئەمجاریش لەبیرت نەچێتەوە برنج بکڕێ با ئەو لاوێچە برینجە لە مستتدا بێ، کە دەیبینی وەبیرت دێتەوە ،

کابرا زۆر بە بازاڕیدا دەگەڕێ،بێ ئەوەی لەبیری بێ بۆ چی هاتووە. پاش ماوەیەک بە عارەقەی دەستی ناڕەحەت دەبێ برینجەکە دەڕێژێ و دیسانیش وەبیری نایەتەوە .دەگەڕێتەوە خێزانی دەپرسێ ؛

ـ کوا برینجەکە ؟

ـ برینجی چی ؟

ـ ئەدی نەمگوت با ئەو لاوێچە برینجەت پێ بێ تا لەبیرت نەچێتەوە

ـ سبحان ا ... برینجەکەم رشت ، هەرچەندم بیر لێ کردەوە نەمزانی بۆچیم پێیە!

### " تانجی و کەروێشک "

کابرایەکی راوچی تانجی لە کەروێشکێک بەردا ، کەروێشکەکە بەم هەڵاتنەوە خۆش خۆش ئاوڕی دەداوە و بە تاجییەکەی دەگوت :

ـ خۆ ماندوو مەکە ، نامگرێوە . رێوی دەیگوت :

ـ چۆن ناتگرمەوە لاقم لە لاقی تۆ درێژترە و لە تۆش بەهێزترم.

کەروێشک دەیگوت :

ـ ئاخر من بۆخۆم هەڵدێم تۆ بۆ یەکی دیکە .

### ( وەڵامی بەجێ )

**مامۆستا :** ئێمە لەتۆرەی ئادەم و حەواین .

**قوتابی :** ئەدی بۆ باوکمدەڵێ ئێمە لە تۆرەی مەیموونین؟

**مامۆستا :** کارم بە بنەماڵەی ئێوە نیە !!

---

## پەندی پێشینان

خۆ مەزن نەکە داتۆ نەشکێ .
خەو و کەو ناگەهین ئێک .
داری ستوێر نابت کوپال،
داوەتا میرا و گر لە فەقیرا .
شەوا تاری دیارە لە ئێڤاری .
لێڤ ژ ددانا پێشترن .
نکارت کەرێ دکارت کورتێن .
کەس بێ سەلا نابت مەلا .
شێر ژ بیشیا خلاس نابن .
تێری چی هایی ژ برسی هەیە .
لە عەرشەوە تاکوو فەرش.
کەس بە دۆی خۆی نالێ ترش.
هەر عەقڵەی لە خەسارێکی.
برامان برایەتی کیسەمان جودایەتی.
قشقەڵە بە خۆرایی پشتی گامێش ناخورێنێ.
خوا هێلانە بۆ داعبای کوێریش دەکا.
بەرخ هەتا هەتایە لەبن سەوەی دانابێ.
دەستە وەستان چ لە گەرمێن چ لە کوێستان.
دزی خومالی ناگیرێ.
مەنجەڵی میران بە حەوت سال دێتە جۆش.

## جەسارەتە!

لە خوا لێخۆش بوو ،مەلا ــ ئەحمەدی تەوحیدی یان پرسی: لە خۆت قسە خۆشتر دیــوە ؟ گوتی بەڵێ : جارێک لــە تەورێز زۆر تەنگاو بــووم، لە تاوان خۆم لە رستۆرانێکی مەلا نەخۆرە هاویشت ،گارسۆن هات و ناویخواردەمەنی‌یەکانی خوێندەوە لە نیوەی‌دا قسەم بڕی و بە تورکی گوتــم : جەسارەت... نەهیشت ، قسەکەم تەواو بکەم و دەستی گرتم و بردمی‌یە بەردەرکی ئاوەدەست و گوتی جەسارەتیشمان هەیە .

## نەخۆش

کابرایەکی چرووک لاقی دەشکێ و دەچێتە لای جەڕاح.

ــ لاقت دەبێ لە گێــچ بگرین ، خەرجیشی دوو هەزار تمەنە .

ــ ئای دوکتۆر ! ناکرێ لە قوڕی بگری و هەزار تمەنــم لێ بستێنی ؟

لێرەدا سوپاسی کاک ئەحمەد دەشتی ، کاک عەلی زەبیحی ، کاک ئیبراهیمی ئەفخەمی ، کاک ئازاد عیسا، کاک کاوەی شنۆیی مەحموود ــ زادە ، کاک بیهزادی میر ئەحمەدی دەکەین کە بە ناردنی دیاری ئەم لاپەڕەیان بۆ رازاندینەوە.

## گاڵتەی جێژن

جۆگەلەی خوێنە لە ناو دیدەیی گریانم دا
زۆر لەمێژە نیە هیچ "عانە" لە گیرفانمدا

هەر دەڵێی جەرگی منە لەت‌لەت و سوور و کون کون
ئەو "تەماتە"ی هەڵی خست "مێرێ" لە سەربانمدا

"جگەرە"ی "رۆزمەن" ئەڵێن زۆرە بەڵام من‌نەمدی
غەیری ئەو رۆژە لە ناو باخەڵی میوانم دا

سەرم "ئەسلەع" بووە هەرچەشنی "کەدو" ئێستە نیە
دانەیەک ئەسپێ لەناو زولفی پەرێشانم دا

تۆ کە "جووجە"ی وەرە ناو کاولی مەعدەم! چ دەکەی؟
لە سەرانگوێلک و ،تەویلە ،لەبن هەیوانم دا

من کە دەمگوت نیە "شوخێک" کە دڵم بڕفێنێ
"گۆشت بزن " هات و بە جارێک سەروسامانم دا

من لەلام وابووکە هەر "گیپە."یە رێی چارەکەچی
"ساوەریش" چەشنی مەسیحایە لە "دەرمانم" دا

" رانک و چۆغە "شرەکەی من کە بە سووری هاوین
لەرز و تام لێیە ئەبێ چۆن بێ لە زستانمدا

دەنگی ریخۆڵەمە شمشاڵ لە زگمدا چ دەکا
ئەوە سازێکە لە ناو "بەزمی" فەقیرانم دا

شیعرەکانم مەبە کاکە نەکوو رۆژێک لە نەکاو
تۆش بدەی کەولی "خەز" و "تورمە"بەسەرشانمدا

هەموو کەس دەردی هەیە کاکە بەڵام دەردی من
هەر گرانتر دەبێ وەک گوێلکی لە پزدانم دا

"جێژنە"یە وبۆنی "کەباب" دێ لە هەمووڵاوە ومنیش
هەر کولۆی خوێیە کە قرچەی دێ لە قەلیانمدا

مامەلی خۆش بی ئەتۆ ودەرد و بەڵات هەرچی هەیە
با لە نانی رەق و چای شیرنی بەیانانم دا

# پەیامی ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەیووبی

## بۆ مامۆستایان و قوتابیان و خوێندکارانی کورد بە بۆنەی

**برایان ، خوشکینە، قوتابیان خوێندکاران،مامۆستایان !**

**لە بەرەبەری کرانەوەی قوتابخانە و زانستگاکاندا ، کە وەرزی پشکووتنی خونچەکانی عیلم و زانستە ،پەیامێکمان هەیە بۆ هەموو ئەوانەی قەڵەم بە دەستەوە دەگرن تا تێشوو و زەمهەری زانست بۆ دوارۆژێکی رووناک پاشەکەوت کەن !**

**دەبێ هەموو هەل و مەرجی ناسکی وڵات و کوردستانی خۆشەویستمان بناسن و بۆ رزگاری ئەوانە کە کۆیلەی دەستی دێوەزمەی نەخوێندەوارین خەبات بکەن .**

بروانن دەستی لەرزۆک و شەقاری پیرەپیاوان و پیرێژنان کە لەبەر کاری برست بڕ خوێنیان لە تەواوی ئەندامی لەشی زاوە .بڕوانن دەم و چاو و توێڵی توێ توێی هەژارەکان لە دێ و دێهاتی وڵات کە هەرکامیان چیرۆکێکی دوور و درێژی پڕ لە تاڵی و سوێرییان تێدا دەخوێندرێتەوە، هەموو نوێنەری مەینەت و ئازارێکی جەرگبڕن، هەموو وینەگەری خەبات و بەربەرەکانییەکی درێژ خایەنن لەگەڵ خۆڕسک و تەبیعەتی سەرکێش . جا چ لە بەزرایی چیاکان و چ لە قووڵایی دۆڵ و دەرەکاندا. ئێمە دەمانەوێ ئەم ناسۆرانە بنەبڕ کەین **.کە وابوو ئەرکی سەرشانی هەر ئینسانێکی بەشەرەف و هەر کوردێکی شەریفە کە لەو رێگا پڕ کەند و کولۆیەدا بەخەباتی بێ وچانی خۆی درێژە بدا هەتا شوێنەواری نالەباری نەخوێندەواری لەسەر روخساری ژیانی ئەم گەلە چارەرەش و ستەم لێکراوە راماڵێ.**

چینی پێشەنگ لەو جیهادە پیرۆزەدا ئێوەن، بەرپرسی ئەم کارە بەشی زۆری لەسەر شانی ئێوەیە .ئێوەن کە دەبێ دیمەنی دوارۆژی کوردستانتان لەبەر چاو بێ.جوانی و دزێوی ئەم دیمەنە بە دەس ئێوەیە .

ئێستا ئێوەن کە لە مەتەرێزی عیلم و زانستدا‌ن بە یارمەتی خودا و بڕوا بە خۆ و پشت بەستن بە نرخ و ئیستیعدادی نادیاری خودا پێداوتان دەتوانن لەم راپەڕینەدا بەشداری بکەن و دوارۆژ لەبەر بەرو بووتان بحەسێتەوە دێوەزمەی رەشی نەزانی سمکۆڵ دەکا پەلاماری بەرنە سەر و ژیانی فەرهەنگی رەسەن و مەکتەبی خۆتان رزگار کەن .

مەوەستن و وچان مەدەن، تا ئەو رۆژەی جووتێری داپەڵۆسراوی بێ بەش دەحەسێتەوە ،تا ئەو کاتەی دوکتور و دەرمان زۆر بێ و ژنی دووگیان لە نێو نەچێ و داخێکی بە جەرگی خوشەویستەکانی دیکەیەوە نەنێ .تا ئەو رۆژەی مامە ـ پیرە بۆ نووسینی نامەیەک دەرک بە دەرک نەگەڕێ.

**بەڵێ ئەرکی ئێوە زۆر لەمە گرانترە ! ئێستا ئێوەن و هەزاران چاوی چاوەنواڕی ژن و پیاو و گەنج و لاو .هەموو چاویان لە دەستووبردی ئێوەیە .بۆ دیتنی تەنانەت ساتێکی خۆش چاوەڕوانن چاویان لە ئاسۆ بڕیوە ،ئاخۆ**

# «ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی»

## ساڵی تازەی خوێندن

**کەی گزینگی بەختەوەری سەر لە سوێگە و کێوی بەرز دێنێتە دەر و لک و پۆپی دارستانی ژیان بەیان باش دەڵێ!**

ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بە شانازییەوە خۆی هاوبەشی ئەم خەباتە دەزانێ و شان بە شانی ئێوە بۆ بوژاندنەوەی فەرهەنگی رەسەنی کوردی و پەرەپێدانی ئاگاداری و زانستی گەلی موسڵمان و زۆرلێکراوی کورد هەنگاو دەنێتەوە.هەر بۆیەش هانا دەباتە بەر شەپۆلی پڕ تەوژمی چینە جۆراوجۆرەکانی فەرهەنگی. لەسەر ئەو بڕوایەیەکە هاوکاری هەموو لایەن دەتوانێ دواڕۆژی رووناکمان بۆ نزیک کاتەوە و رێگای پڕ لە تەنگ و چەڵەمەمان بۆ خۆش دەکا.

لەم هەل و مەرجەدا کە بە لوتفی خودا ئەم راپەڕینە فەرهەنگی ئەدەبییە بە هیممەتی مامۆستایانی ئایین و ئەدەب،ئەدەبدۆستان و زانایان دەستی پێکردووە و سروەکەی فێنکایی دەخاتە دڵ و هەناوی تینووانی ئەدەب،

لە وەدی هێنانی ئامانجەکانی دا پشتی بگرن ، کە دەتوانێ رۆژ لە رۆژ پتر حەول بدا ، هەموو لا باریدەی بدەن.

**لە کۆتاییدا پێشنیارمان ئەوەیە کە ئەم ساڵ بە ساڵی جیهادی فەرهەنگی بناسرێ و ئەو پەڕی حەول و تەقەلای خۆمان بۆ بنەبڕ کردنی نەزانی و نەخوێندەواری بدەین .**

ئێمە ئامادەین بۆ هەر چەشنە هاوکارییەکی ئەدەبی ـ فەرهەنگی هەرکەس رێنوێنی ـ مان بکا بە باوەشێکی ئاوەڵاوە بەرەو پیری دەچین، ئاواتمان ئەوەیە سروەش بە شێوەیەکی رێک و پێکتر و پڕ نێوەرۆکتر بخەینە بەر دەستی خوێنەران. سەرکەوتووبن . والسلام

ئینتیشاراتی

صلاح الدینی ئەیووبی

**ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی**

---

بقیهء سرمقاله ←

متعال، همه برادران و خواهران کرد را بیاری میطلبیم و درحالیکه یقین داریم بدون پشتوانهء مردمی این تلاشها بثمر ننشسته و این نسیم پایان میپذیرد، اعلام میداریم که این نشریه متعلق به هیچ قشر خاصی نبوده و از همه اقشار مردم مظلوم کرد از جمله :

**علما و روحانیون معظم ، فرهنگیان ارجمند،دانشجویان و دانش آموزان گرامی علاقمند و خلاصه قاطبه ادبدوستان و اساتید عزیز و بزرگوار ، انتظار داریم که کماکان "سروه" را از آن خود دانسته و با دقت و عنایت به محتویات ، شکل، قطع ، قیمت ، و...و خلاصه تمامی ابعاد آن با انتقادات و پیشنهادات اصولی و سازندهء خود ، موجبات پشتگرمی و امیدواری دست اندرکاران را فراهم و ما را در تحقق طرحهای آینده و در خدمت به فرهنگ غنی خود یاری نمایند.**

سلامتی و سعادت همهء عزیزان را از خداوند منان مسئلت مینمائیم .

" هیئت تحریریه"

**پاشماوەی مەوەلەوی**

ئەم شیعرە دەنووسێ :

**خامەی سەراوێز نە چای سیایی**
**مەڕێزۆ ئەسرین شەکوای جیایی**
**نامەی سەد شکەنج وەهەم پێچ وەردەن**
**چون من سەرتا پاشکەستەی دەردەن**
**دەوات دووی سیاش جە دەم مەخێزۆ**
**نامە سیا خاک وە سەر مەڕێزۆ**
**دەوات دووی دەروون گێج دان وەهەمدا**
**لیقە وێش کێشان وەلیتەی خەم دا**
**خامە شەق وەردەن دەم مەکەردەوە**
**زار زار مەناڵۆ وە دەم دەردەوە**
**مەوات هەی ئاوات واستەکەی جەستەم**
**هەی مۆمیایی پێشەی شکەستەم**
**کام زام بی جە تۆ من نەویم نەسیب**
**جەفا هەر وەمن ، وەفا پەی رەقیب**
**زامان تاونان هوونا وان جۆ جۆ**
**دەرد وەبان دەرد یەجە دووری تۆ**
**بڕیان تای رووبار قافیە خانیم**
**نەمەندەن تاقەت عیبارەت زانیم**
**دەمەی هەناسەی گەرم تارەکەم**
**نە کوورەی دەروون پڕ جە خارەکەم**
**ئایردان حوجرەی دڵەی پڕ دەردم**
**سۆچنان کتاو مەجمووعەی فەردم**

لەو سووتانەدا نەک هەر کتێبخانە بەڵکوو حوجرەی دڵیشی دەسووتێ عەنبەر خاتوون بەشێک لە سەرچاوەی ژیان و شیعری ، وەفات دەکا و پۆلوویەکی سووری ئاورین بە گیانە نازەنینەکەیەوە دەنووسێ و بۆ چزە و چرووکی دەگاتە هەموو شاخ و داخ و داوێن و بەندەنەکانی کوردستان . بەڵێ مەرگ نازدارە مەحبووبەکەی بە دیل دەبا و ناڵە لەگیان و دڵی دەخا :

**شووڕای عاشووڕان دیسان بەزمش بەست**
**( موحەڕڕەم )ئاما (مەحرەم) شی نەدەست**
**ئەو خەریک نە چۆڵ شار عەدەمدا**
**من نە (کەربەلا)ی سارای ماتەمدا**
**ئەو ( یەزید ) مەرگ وەئەسیر بەردە**
**من زادەی ( زیاد ) خەم یەقیر کەردە**
**بازاڕەن ، وادەی مامەڵەن، ساقی**
**هەی بگرە فانی، وەی بدەر باقی**
**رۆ ،( حسەین ) ئاسا فەردا کە رۆ بۆ**
**داخۆم سەر جەکۆ،لاشەم جەکۆ بۆ ؟**

حەوت ساڵ بەر لە وەفاتی چاوە گەشبین و جوانەکانی کوێر دەبن و لە ساڵی ١٣٠٠ ی کۆچی پاش ٧٩ ساڵ تەمەنی پڕ لە تەنگ و چەڵەمە و خزمەت ، کۆچی دوایی دەکا و لە گۆڕستانی ( ئەسحابە ) لە نزیکی(سەرشاتە)ی تاوەگۆز بە خاک دەسپێردرێ .

**شەوەن خەڵوەتەن، ماڵ بێ ئەغیارەن**
**ئاڵەم گرد وتەن، دۆس خەوەردارەن**

**( بێسارانی )**

---

**پاشماوەی جوغرافیای ...** وێژرا لە سنووری گشتی تێ ناپەڕێ ، چونکوو فەلاتی کوردستان بەوەی کە هەموو بابەتە جیاجیاکانی جوغرافیایی هەیە لە هەموو جێگایەکی ئاو و هەوای وەکوو یەک نیە، بەڵکوو دەتوانین بۆ هەر مەڵبەندێکی ئاو و هەوایەکی تایبەتی دەس نیشان بکەین ، بۆ نموونە ئەو مەڵبەندەی کە شاری سنەی تێدا هەڵکەوتووە چونکوو زۆر ڕۆژان هەتاوی تێدەکا لە مەڵبەندی هەورامان و مەریوان زۆر گەرمتر و وشکترە و بە گشتی داوێنەی رۆژهەلاتی چیاکانی زاگرۆس گەرمتر و وشکترن لە داوێنەی لای رۆژئاوای ئەو چیایانە و ئاوەڕۆی چۆمەکان و ئەندازەی بەرزایی مەڵبەندەکانی کوردستان لە ئاڵ و گۆڕ بوونی جۆری ئیقلیمی ئەم مەڵبەندەدا زۆر کاریگەرە .

( تەواو )

# در کلیهٔ شهرستانها نمایندهٔ فروش «انحصاری فعال» میپذیریم

انتشارات صلاح الدین ایوبی ( مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی ) درنظر دارد بمنظور رساندن هر چه بهتر و سریعتر مجلهٔ سروه و سایر کتب و نشریات خود بدست علاقه‌مندان در کلیهٔ شهرها بویژه در شهرها و مناطق کردنشین و شهرهای تهران ، تبریز و کرج نمایندهٔ فروش انحصاری انتخاب کند .

یکی از شرایط مهم برای نمایندگی فروش انحصاری در هر شهر این است که بتواند بدون استثناء تمامی کتابفروشیها و مطبوعات فروشیهای آن شهر را که مایل به توزیع نشریات ما باشند تحت پوشش خود قرار بدهد .

ضمناً برای نمایندگی انحصاری فروش نشریات این مرکز ، نمایندگان فروشی که قبلا فرم قرارداد با ما را امضاء کرده‌اند حق تقدم دارند .

برای عقد قرارداد و یا کسب اطلاعات بیشتر می‌توانید با آدرس زیر تماس برقرار کنید .

" اورمیه : صندوق پستی ۷۱۷ ـ خیابان باکری ـ انتشارات صلاح‌الدین‌ایوبی"
" تلفن : ۳۵۸۰۰ "

در ضمن باطلاع خوانندگان عزیز مجلهٔ سروه میرسانیم که در حال حاضر میتوانند این مجله را از مرکز زیر تهیه فرمایند .

۱ ـ بوکان : خیابان انقلاب کتابفروشی صالحی .

۲ ـ مهاباد : فلکهٔ شهرداری،مطبوعاتی قربانعلی کریمی .

۳ ـ مهاباد : کتابفروشی خانی .

۴ ـ مهاباد : خیابان سید نظام ، جنب مخابرات ، کتابفروشی حمیدی .

۵ ـ مهاباد : کتابفروشی موفقی .

۶ ـ سنندج : خیابان شهدا ،روبروی داروخانهٔ رازی ، کتابفروشی گوران .

۷ ـ سنندج : خیابان فردوسی ، نمایندگی روزنامهٔ اطلاعات .

۸ ـ اورمیه : خیابان امام ، کتابفروشی انزلی .

۹ ـ اورمیه : کتابفروشی واقع . در ترمینال بزرگ .

۱۰ ـ اورمیه : خیابان شهید باکری، نبش‌کوی ساعد ، انتشارات و کتابفروشی صلاح الدین ایوبی .

۱۱ ـ باختران : مسجد جامع اهل تسنن .

۱۲ ـ سقز : جنب مسجد جامع کتابفروشی محمدی .

۱۳ ـ سقز : کتابفروشی نیما .

۱۴ ـ زیوه : آقای خالد شکری ( فعلا ساکن دیزج مرگور )

۱۵ ـ نقده : جنب ژاندارمری ،کتابفروشی خیام .

۱۶ ـ سردشت : نمایندگی روزنامه‌اطلاعات.

۱۷ ـ تهران : روبروی دانشگاه ،کتابفروشی طهوری .

# شیعرێک لە مەستەفا بەگی

# کوردی

عەزیزان من ئەوا رۆیشیم لە لاتان
لە مەزلوومان بلەد چۆڵ بێ وڵاتان

مەڵێن کەلکی نەبوو رۆیی جەهەننەم
سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان

لە گیۆن پادشای لوتف و عەداڵەت
بەخوا حەیفە بڕەنجێنن لە داتان

ئەگەرچی خاکی خۆڵی راگوزارم
بەسەرما خۆڵ کەن عار ناکا سەرباتان

لەگەڵ رۆیشیم جەهەننەم پڕ مەکەن لێم
لە من خاڵی مەکەن گۆشەی دەستەڵاتان

منم سەرگرتیان بۆ لەشکری خەم
دەترسم من بڕۆم لەشکری سوپاتان

ئەگەر سەربووە گەردل بووە کەرووح
هەموو رۆیین چ نیسترە تەماتان

سەفەرمان چونکە زۆری هات و نەهات
دوعامان بۆ بکەن نێو خواتان

نەوەنزە بجوو و کاکوردی لە جارجار
بلێن یادی موحیبی بێ ریاتان